


المعهد العالمي للفكر الإسلامي ١٦

# التدليس عند علماء الحديث

إبراهيم فتاح




مركز الزهاوي للدراسات الفكرية




پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ١٦

# تەدلیس لای زانایانی حەدیس

نووسینی:
ئیبراهیم فەتاح






سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی





ناوی کتێب: تەدلیس لای زانایانی حەدیس.

نووسینی: ئیبراهیم فەتاح

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (١٦).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٢٢٠٥)ی ساڵی (٢٠١١)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١١.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ ئەو خوا تاك و تەنهایەی کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەربارەی پێغەمبەرە نازدارەکەی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى)[1]. واتە موحەممەد هیچ دوانێك و فەرموودەیەکی بە ئارەزووی خۆی نەدرکاندووە، بەڵکو وتەکانی جگە لە پەیامێکی خوایی کە بۆی ناردووە، هیچی تر نین.

سەڵات و سەلامیش لەسەر ئەو پێغەمبەرە بێت کە دروشمی بەزەیی خوایە بۆ هەموو جیهانیان و بوونەوەران و لە یەکێك لە فەرموودەکانیدا دەفەرموێت: (من كذبَ عليَّ متعمِّداً فَلْيتبَوَأْ مقعدهُ من النار)[2]. واتە: هەرکەسێك بە ئارەزووبازیی خۆی درۆ بە دەمی منەوە بکات، با نیشتەجێ بێت لە شوێنەکەی خۆیدا لە ئاگری دۆزەخدا، واتە بەم درۆ هەڵبەستنەی جێگایەکی لە دۆزەخ بۆ خۆی گرت و تەرخان کرد.

خوای گەورە لە یەکێك لە ئایەتەکانی قورئاندا موژدە دەدات بە پێغەمبەر و هەموو ئوممەتەکەی کە نیگەران نەبن دەربارەی قورئان و نەترسن لە فەوتانی و گۆڕانی، چونکە خوای گەورە خۆی قورئانی ناردووەتە خوارەوەو هەر خۆشی پارێزگاریی لێ دەکات، کە دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)[3].

گومانیشی تیا نییە، کە پارێزگاریی قورئانیش لە لایەن خوای مەزنەوە، بە بەدیهێنانی چەند هۆکارێکی پێویست بۆ ئەو مەبەستە دێتە دی، کە وا دیارە یەکێك لەو هۆکارانە، ئەو

---

[1] ئایەتەکانی ژمارە (٣ـ ٤) لە سورەتی (النجم).

[2] حەدیسێکی صەحیحە لە هەر شەش پەڕتووکە متمانەپێکراوەکانی حەدیسدا و مووەتەئی مالیکدا هاتووە، بڕوانە فتح الباری ٢٦٧/١ ژمارە ١٠٧، وە (صحيح مسلم) ژمارەی (٣ـ٤) و (التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد) ٣٧/١.

[3] ئایەتی ژمارە (٩) لە سورەتی (الحجر).

خۆشەویستییە زۆرو بەهێزەیە کە خوا خستوویەتییە ناو دڵی گرووپێکی دڵسۆز و کارامە و لێهاتوو لە زانایانی ئەم ئایینە، دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە هەموو توانایەکی خۆیان خستۆتە کار لە پێناوی پاراستنی ئەو فەرموودانەدا، تاوەکو ون نەکرێن و لێیان کەم و زیاد نەکرێت و وتە و ماناکانیان نەگۆڕێنرێن و درۆیان تێکەڵ نەکرێت. کە دیارە پاراستنی ئەو فەرموودانەش لەم جۆرە دەستکارییانە، لە هەمان کاتدا پاراستنی قورئانیشە، چونکە چەندین ئایەت هەیە لە قورئاندا کە بۆ چەسپاندنی یاسایەك، یان روونکردنەوەی یەکێك لە حوکمەکان، یان ئەنجامدانی جۆرێك لە عیبادەتەکان، بەڵام ئەگەر یارمەتی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، وەرنەگیرێت هەرگیز داواکراوی ئەو ئایەتە جێبەجێ نابێت، چونکە دەبینین خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەنجامدانی چەندان جۆر لە خواپەرستی و تۆڵەی تاوانکارانو هەڵسوکەوت لەگەڵ کارەکاندا داوا فەرمووە، بەڵام بەبێ روونکردنەوە و چۆنێتی ئەنجامدانەکەی و مەرج و پێداویستی ئەو تۆڵە و هەڵسوکەوتانە، هەر هەموو ئەو روونکردنەوانەی سپاردووە بە پێغەمبەرەکەی، وەکو دەفەرموێت: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ)[٤]. واتە: ئێمە قورئانمان ناردووە بۆ لای تۆ، تاوەکو تۆش روونیکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی کە نێرراوە بۆیان.

نموونەی ئەو فەرموودانەی قورئانیش کە پێویستیان بە روونکردنەوە هەیە گەلێ زۆرن، بەڵام بۆ ئاماژەکردن و روونکردنەوە وەکو ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە فەرمانی تیا دەدات و دەفەرموێت: (وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ)[٥]، نوێژ بکەن و زەکاتی ماڵەکانتان دەربکەن، بەڵام نوێژ چۆن بکرێت و لە شەو و رۆژێکدا چەند جار بکرێت؟ هەر جارەش چەند رکات بکرێت؟ رکاتەکان چۆنن و چۆن دەکرێن و لە هەر جووڵە و وەستانێکدا چی دەوترێت و دەخوێنرێت؟ سەرەڕای ئەمانە نوێژ لە سەر کێ پێویستە؟ مەرجەکانی دروستییەکەی کامانەن و چەندان پرسیاری تریش کە پێویستیان بە زانین هەیە، هەر هەموو ئەمانە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بە فەرموودە و کردارەکانی روونی کردووەتەوە.

---

[٤] سورەتی (النحل) (ئایەتی: ٤٤).

[٥] سورەتی (البقرة)، (ئایەتی: ٤٣).

هەروەها داوای دەرکردنی زەکاتی کردووە، بەڵام لە چی و چیدا زەکات دەردەکرێت؟ ئەوەی کە زەکاتی تێدایە دەبێ ژمارەکەی یان قەبارەکەی چەندە بێت و بڕی زەکاتەکە چەندە کە پێویستە بدرێت و لە ساڵێکدا چەند جار پێویستە دەریبکەیت، چەندین زانیاری تریش لەم بوارەدا کە پێویستە ئاگاداری بین، هەر هەموو ئەمانە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە وتار و کردارەکانی روونیکردووەتەوە.

کەواتە لێرەدا روون بووەوە کە پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) هۆیەکە لە هۆکارەکانی پاراستنی قورئانی پیرۆز.

کاتێك کە دەڕوانیتە مێژووی ئیسلام و زانستەکانی، دەبینی کە خوای گەورە کۆمەڵێکی لە پیاوچاکان و هەڵکەوتووان و دڵسۆزانی، لە زانا گەورەکانی ئیسلام رەخساندووە بۆ ئەوەی کە هەستن بەم ئەرکە قورس و گەورەیە. واتە کۆکردنەوە و نووسینەوە و پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەم کۆمەڵە بەراستی پێشەوا و سەردەستەی دڵسۆزانی ئیسلام بوون، بە تەواوی توابوونەوە لە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوادا و خۆشەویستی ئایینەکەیدا و پەیڕەوی کردنی شەریعەتەکەی، ئەوەبوو هەموو تەمەنی دوور و درێژی خۆیان و هەموو توانا و بیر و هۆشیان تەرخان کردبوو بۆ خزمەت کردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر و گەڕان بە دوایدا بە بڕینی بیابانەکان و دەریاکان و رۆژهەڵات و رۆژئاوای زەوی و ئەوەندە شارەزاییان لەو فەرموودانەدا پەیدا کرد و بیریان لێ کردەوە، تاوەکو هەموو فەرموودە راستەکان و ناڕاستەکانیان ناسی و چاك و خراپیان لێك جیاکردەوە، ئەو زانا هەڵکەوتووانە، بەهۆی نیەتی پاك و بێگەردی خۆیانەوە و پشتگیرییان لە لایەن خوای مەزنەوە، چەندین یاسای بەهێز و ورد و کاریگەرییان داهێنا بۆ ساغ کردنەوەی دەقی فەرموودەکان و جیاکردنەوەی راستەکانی لە ناڕاستەکانی، کە زۆر بەهێزتر بوو لەو ئامێرانەی کە صەڕافەکان درهەم و دیناری راست و تەزویری پێ دەپشکنین، هەروەها کەوتنە پشکنینی ژیاننامەی ئەو کەسانەی کە ئەو فەرموودانەیان دەماودەم لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) گەیاندووەتە ئێمە، ساغیان کردەوە، هەر یەکێك لەو کەسانە خەڵکی چ وڵاتێکە و کام شار و کام گوندەیە، چ ساڵێك لە دایك بووە و لەسەر رێبازی کام لە ئیمامەکانی ئیسلامە و بیروباوەڕی چۆن بووە و ئەو زانیارییانەی کە زانیونی کامانەن و ئەو مامۆستا و شێخانە کامانەن و کێ

بوون كه له خزمه‌تياندا خوێندوويه‌تى و چه‌ند گه‌شتى له ژيانيدا كردووه و ئه‌و گه‌شتانه بۆ كام وڵاتانه بوون؟

به كورتى به دواى هه‌موو ورد و درشتێكى ژيانياندا گه‌ڕان و هه‌ر هه‌موو ئه‌م زانيارييانه‌شيان به‌س بۆ ئه‌وه‌بوو، تاوه‌كو ئه‌و كه‌سانه‌يان ده‌ستكه‌وێت، كه شايانى ئه‌وه بن كه فه‌رمووده‌كانى پێغه‌مبه‌ر (دروودى خواى له‌سه‌ر بێت) بگێڕنه‌وه بۆ خه‌ڵكان و هه‌روه‌ها جێگاى متمانه‌ش بن بۆ ئه‌وه‌ى ئه‌و فه‌رموودانه‌يان لێ وه‌ربگيرێت، دياره بۆ ئه‌م جۆره كه‌سانه‌ش كۆمه‌ڵێك مه‌رجى به‌هێز و كاريگه‌ريان دانابوو، كه ئه‌گه‌ر ئه‌و مه‌رجانه‌يان تيادا نه‌بوايه هه‌رگيزاوهه‌رگيز هيچيان لێ وه‌رنه‌ده‌گيرا.

وا دياره مه‌رجى ئيسلام بوونى ئه‌و كه‌سه كه فه‌رمووده ده‌گێڕێته‌وه له پێش هه‌موو مه‌رجه‌كانى تره‌وه ره‌چاوكراوه، كه دياره ئه‌و كه‌سه‌ى موسڵمان نه‌بێت هيچ نرخێك له‌م جۆره بوارانه‌دا بۆ سيفاته‌كانى ترى دانانرێت[٦].

مه‌رجێكى تريش له‌و مه‌رجانه ده‌بێت ئه‌و كه‌سه عاقڵ و ژير بێت، چونكه گێڕانه‌وه‌ى فه‌رمووده، بريتييه له ده‌قێك كه له چه‌ند وشه‌يه‌ك پێكهاتووه كه مانايه‌كى سنوردارى خۆى هه‌يه كه‌واته ئه‌و كه‌سه‌ى كه ده‌يگێڕێته‌وه ده‌بێت به تێگه‌يشتنه‌وه بێت، نه‌ك له‌به‌ركردنى وه‌ك تووتى بێ حاڵى بوون.

له‌به‌رئه‌وه‌ش كه عاقڵى شتێكى نادياره و قورسه بڕيارى به‌رامبه‌ر ده‌ربكرێت، له‌به‌رئه‌وه نيشانه‌يه‌كيان داناوه كه زۆربه‌ى كات به‌ڵگه‌يه له‌سه‌ر ته‌واويى عه‌قڵ، ئه‌ويش باڵغ بوونه، كه‌واته ئه‌گه‌ر ئه‌و كه‌سه منداڵى نه‌باڵغ بوو يا شێت بوو، ئه‌وا فه‌رمووده‌ى لێ وه‌رناگيرێت، چونكه ئه‌م جۆره كه‌سانه ناتوانن باش و خراپ و راست و چه‌وت لێك جيابكه‌نه‌وه.

لێره‌دا زانايانى حه‌ديس ده‌فه‌رموون: ئه‌و منداڵه‌ى كه گه‌يشتووه‌ته ته‌مه‌نى ته‌ميز و ناسينى باش و خراپ، ده‌توانێت فه‌رمووده وه‌ربگرێت و له‌به‌ريان بكات، به‌ڵام هه‌تا نه‌گاته قۆناغى باڵغ بوون، بۆى نييه بيگێڕێته‌وه بۆ خه‌ڵكان[٧].

---

[٦] المستصفى / ١٥٦ـ ١٥٧.

[٧] الكفاية في علم الرواية، ل٥٤.

مەرجێکی تریش لەو مەرجانە پێویستە ئەو کەسە خاوەنی (ضبط) بێت، واتـە بـە جـوانی و ڕاست و ڕەوانی و تێگەیشتنی مەعناوە، فەرمووده‌کـه وەربگرێـت و لەبـەری بکـات و هـەر بـەو جۆرەش بیگەیەنێت بە خەڵکی، واتە هـەر لـە کـاتی وەرگرتنـەوە هـەتا کـاتی گەیانـدنی نابێـت گۆڕان و بیرچوونەوەی بەسەردا هاتبێت، کەواتە لێرەدا ڕۆڵی کاریگەر دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکیـی کەسەکە و هێزی لەبەرکردنی و بە وردی تێگەشتنی[8].

لێرەدا زانایان پێوەریان بۆ بڕیاردانی (ضبط) بۆ ئەو کەسە ئەوەیە کـە دێـنن حەدیسەکەی ئەم بەراورد دەکەن لەگەڵ هەر ئەم حەدیسە خۆیـدا لـە لای زانـا متمانـەپێکراوەکان و خـاوەن چهبتەکانی تر، جا ئەگەر فەرموودەکەی ئەمیش وەکـو ئـەوەی لای ئـەوان وابـوو، ئـەوا بڕیـاری (ضابط)ی بۆ ئەمیش دەدرێت، شایانی باسیشە کە ئەگەر بـە دەگمـەن جیـاوازی هـەبێت، ئـەوا چاوپۆشی لێ دەکرێت، بەڵام ئەگـەر جیاوازییەکـە زۆر بێـت ئـەوا سـیفەتی (ضـبط) لـە دەسـت دەدات و فەرموودەکەی لێوەرناگیرێت[9].

ئەوی ڕاستی بێت زانا گەورەکانی حەدیس، وەرگرتنی حەدیسی شاز و دەگمـەن و ئەوانـەی کە لەلای زانا متمانە پێکراوەکانەوە، وێنەیان نییە و نەبیستراوە، ئەوە بە سەرپێـچی لـە ئـایین دادەنێن و بە تاوانێکی گەورەی دەدەنە قەڵەم، دەگێڕنەوە کە شوعبە[10] دەیفەرموو حەدیـسی دەگمەنت دەست ناکەوێت مەگەر لـەلای کەسـانی دەگمـەن نـەبێت، واتـە ئـەو کەسـە کەسـێکی نەناسراوە و و دوورە لە کۆڕی زانایانەوە، کەواتە شایانی ئەوە نییە بیکەی بـە شـێخی خـۆت و زانیاریی لێوەرگریت[11].

مـەرجێکی تـریش لـەو مەرجانـە، بـە پێویستیـشیان زانیـوە کـە ئـەو کەسـە (عـادل) بێـت، مەبەستیشیان لەم مەرجە ئەوەیە کە کاروبار و ئەرکەکانی ئایین بـەرێکوپێکی جێبـەجێ بکـات،

---

[8] تدريب الراوي، ل٢٥٩.

[9] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٠.

[10] شوعبەی کوڕی حەججاجی عەتەکی واسیتی، بلیمەتی حەدیس و زانیارییەکانی ئەوەندە ژیاننامەکەی ڕازایەوە نازانێت چی هەڵبژێرێت بۆ وتن، ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: ئەگەر شوعبە نەبوایە حەدیس لە عێراقدا نەدەناسرا، نازناوی (أمير المؤمنين في الحديث)ی پێبەخشراوە لە ساڵی (٨٢ك) لە دایك بووەو لە (١٦٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٤٧٩/١٢، (تهذيب التهذيب) ١٦٤/٣، (الكاشف) ١١/٢.

[11] الكفاية، ١٤٠ـ ١٤١.

نابێت تـوخنی تاوانـه گـەورەکان کـەوتبێت، بـەردەوامیش نـەبێت لەسـەر تاوانـه بـچووکەکان، هـەروەها خۆیـشی بپارێزێـت لـەو وتـار و ڕەفتارانـەی کـە کەسـایەتی دادەبـەزێنێت و لاوازی دەکات[12].

لێرەدا خەتیبی بەغدادی (عـادل)مـان پـێ دەناسـێنێت و ئامـاژە بـۆ نیـشانەکانی دەکـات و دەفەرموێت: (عادل بەو کەسە دەوترێت کە هەموو ئەرکە داواکراوەکـان جێبـەجێ دەکـات و لـە هەموو ئەوانەش کە داوای واز لێ هێنانیان کـراوە خـۆی بـە دوور دەگرێـت. هـەروەها خـۆی بـە دوور دەگرێت لە کردارە ناشیرینەکان و هەمیشە بە دوای حەق و ڕاستییدا دەگەڕێت لە کردەوە و مامەڵەکانیدا، زمانیـشی دەپارێزێـت لـە وشـە و وتـاری ناشـیرین و نـەگونجاو لەگـەڵ ئـایین و مرۆڤـی خـاوەن کەسـایەتیدا) شـایانی باسیـشە بـۆ بڕیـاردانی (عـادل)ی ئـەو کەسـە پێویـستە کەسێکی متمانە پێکراو گەواهیی بۆ بدات و بەمە نازناوی (عادل)ی بۆ دەسەلمێنرێت[13].

شایانی باسیـشە ئـەو کەسـەی کـە گـەواهی لەسـەر (عـادل)ی کەسـێك دەدات نابێـت بـەس تەماشـای شـێوە و دەم و چـاو و ڕواڵـەت و پۆشـاك و خۆدەرخـستن بـە وەرع و ئاییندارییـەوە بکـات، بـەڵکو دەبێـت بـە وردی بـە دوای کردەوەکـانی و هەڵـسوکەوتەکانیدا بگـەڕێت و لـەو بوارانەدا کە جێگای دەرکەوتنی ڕەوشتی جوان و دوور لە خۆپەرسـتی و بەڵگـەی خێرویـستین، تاقی کردبێتەوە.

لـە ڕاسـتییدا زانایـانی حـەدیس ئەوەنـدە سـڵیان لـە کەسـانی گێـڕەرەوەی فـەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) کردووەتەوە، بە ڕاددەیەکی وەها، کـە فـەرموودەیان لـە کەسانی ئارەزووباز و حەیاتکاوان وەرنەدەگرت[14].

هەروەها ڕەقییـەکی زۆریـشیان دەردەبـڕی بەرامبـەر گێڕانـەوەی فـەرموودە، تەنانـەت لـەو کەسانەش کە هەندێ کاری نابەجێیان دەکرد، با ئەو کارانە لـە خۆشـیاندا حـەرام نـەبن، وەکـو پیاسەکردن بەبێ هۆ بە ڕێگاوبانەکاندا، یان خـواردن و خواردنـەوە لـە بـازاڕ و بەردوکانەکانـدا،

---

[12] توضيح الافكار، ١١٨/٢.

[13] الكفاية ١٤٢، توضيح الافكار، ١٢١/٢، الفروق للقرافي، ٥/١.

[14] (الجامع لاخلاق الراوي) ١٨/١.

یان حەزکردنی زۆر لە گاڵتە و گەپ و دەسبازی، بەڵام یاری کردن بە شەترەنج و عودلێدان و یارییەکانی وەکو دامە و دۆمینە و ئەزنیف، ئەوە حیسابیان گەلێ قورسترە[١٥].

لەوانەیە کەسێك لێرەدا سەری سووڕبمێنێت و بڵێ: باشە ئەم هەموو وردەکاری و سڵکردن و چەند و چوونەی بۆچییە؟ بەڵام ئەگەر بە وردی بیرێك لە نرخی ئەو فەرموودە گێڕراوانە بکاتەوە، ئەوا بێگومانین کە دەستخۆشییەکی گەلێ زۆر لەو زانایانە دەکات، چونکە ئەو فەرموودانە، چەند دەقێکی ئاسایی نین وەکو شیعر و چیرۆك و پەندی پێشینان، تاوەکو گوێ نەدرێتە زیاد و کەمی دەقەکە و جۆری کەسایەتیی لێ بیستراوەکە، دەبینین گەلێ جار ئەم بابەتانە هەر بۆ خۆشیش لێیان زیاد دەکرێت و کەم دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە هیچ لە بابەتەکە نەگۆڕێت، بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بنەمای ئایین، بڕیاردەری حەڵاڵ و حەرامن، ڕێپیشاندەری بەهەشت و دۆزەخن، لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نییە بۆ گۆڕینی تاکە یەك پیتیش یان وشەیەکیش تیایاندا بە دەستی ئەنقەست، تەنانەت ئەو ئەداتانەش کە نەفی دەگەیەنن، یان ئیستیفهام، یان تەئکید، لە خودی مەعنادا و بە هێزی و بێ هێزیدا لە یەکدی جیاوازن، کەواتە هەر دەبێت ئەوەیان بێت کە لە دەمی پیرۆزی حەزرەتەوە هاتووە، بە قوربانی بم. هەر لەبەر ئەم ڕاستییانەشە کە موحەممەدی کوڕی سیرین[١٦] بە هاوڕێکانی دەفەرموو: (خۆ خەریك کردنی ئێوە بە کۆکردنەوەی حەدیسەوە ئایینە، جا بڕوانن کە ئایینەکەتان لە کێ وەردەگرن)[١٧].

دیاردەیەکی سەیری تر لە زانایانی حەدیسەوە ئەوەبوو کە هەندێکیان لەبەرئەوەی ئەو فەرموودانەی کە وەریدەگرن هەر زۆر بێ غەل و غەش بێت، دەهاتن حەدیسیان لە کەسانی زیندووەوە نەدەگێڕرایەوە، چونکە لەوە دەترسان کە نەوەکو ئەو کەسەیان خۆش بوێت و لەبەر خۆشەویستییەکەی گومانی باشی پێ ببەن و لێکۆڵینەوەی تەواوی لەگەڵدا نەکەن، یان لەبەر گیانی کێبڕکێی هاوکارانی هاودەم بە ناحەق ڕقیان لێ بێت و بەرپەرچی بدەنەوە و لەبەر

---

١٥ (الكفاية)، ١١١.

١٦ یەکێکە لە تابیعییە گەورەکان، پێشەوا و متمانەدار و زانا و خواناس بووە، لە ساڵی (١١٠ك) لە دایك بووە و لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل)، ١٥١٨/٧، (الكاشف) ٥١/٣، (تهذيب التهذيب)، ٦٢٦/٥.

١٧ الجامع الاخلاق الراوي، ١٥/١.

دەمارگیری و لووتبەرزی حەدیسەکەی رەت بکەنەوە، دەگێڕنەوە کە ئیمامی شافیعی جارێکیان قوتابییەکی دەربارەی حەدیسێك لەگەڵیدا کەوتە وتوویژ و وتی: ئەم حەدیسەم لە تۆ بیستووە، ئەویش فەرمووی چۆنت بیستووە هەر وەهایە، بەڵام نەکەی لەمەودوا فەرموودە لە زیندووانەوە بگێڕیتەوە[١٨].

هەروەها ئەو زانایانە خوایان لیٚ رازی بێت ئەوەندە گرنگییان بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دابوو، تاوەکو بە هۆی بیرکردنەوەی زۆریانەوە لەو فەرموودانە چەندین زانستی تازەیان دەربارەی حەدیس داهێنا، کە ئەم زانستانە دادەنرێن بە جۆرێك لەو زانستە قەشەنگانەی کە تایبەتن بە گەلی ئیسلامەوە، هەروەها چەندین زاراوەی ورد و رەنگین و ناسکیان دەربارەی جۆرەکانی فەرمودەکان و حەدیس گێڕەرەوەکان داهێنا کە هەر کەسێك لە موسڵمانان و گەلانی دیکەیش دەیان بینێت، سەرسام دەبێت، تاوەکو دەگێڕنەوە کە (مەرتیوس)ی رۆژهەڵاتناس وتبووی: (با موسڵمانان چەندە دەتوانن شانازی بکەن بە زانیاریی حەدیسەکانیانەوە)[١٩] کە لە راستییدا ئەم یاساو زانیارییانەی کە بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دانراوون، لە لوتکەی هەموو ئەو هەوڵ و تێکۆشانانە دادەنرێت، کە مرۆڤ بتوانێت بیان دات لە رێگای ساغکردنەوەی راستیی قسەکان بۆ لای خاوەنەکانیان.

لە راستییدا زانایانی حەدیس مەرجەکانی لیٚ وەرگرتنیان گەلیٚ قورس بوو، هەتا وەکو بە تەواوەتی لە راستیی حەدیسەکە دڵنیا نەبوونایە، لە خاوەنەکەیان وەرنەدەگرت، تا رادەیەکی وەها لەو کەسانە دەکۆڵانەوە کە فەرموودەکانیان لیٚ وەردەگرتن، کە ئەگەر بچووکترین لەکەشیان پێوە بەدی بکردنایە ئەوا متمانەیان پیٚ نەدەکردن و حەدیسەکانیان لیٚ وەرنەدەگرتن.

شایانی باسیشە کە چەند دیمەنێك و کردارێك هەیە، لە هەندیٚ شوێندا دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی، بەڵام لە گێڕانەوەی حەدیسدا هیچ یەکێك لەم بابەتانە نرخی بۆ دانەدەنرا، کەواتە خۆدەرخستن بە تەقواوە و خۆبەستنەوە بە دیاردەکانی سوننەتەوە وەکو هێڵانەوەی ریش و سیواك کردن و پۆشینی پۆشاکی ئایینی و نوێژکردنی زۆر و بەرۆژووبوون و زیکر و فیکرکردن،

---

[١٨] الكفاية ١٣٩، علوم الحديث ١٣٦.

[١٩] التصوير الفني في الحديث النبوي، ل٢٧.

هیچ یەکێك لەمانە نەدەبوو بە تکاکار بۆ وەرگرتنی حەدیس، ئەگەر حەدیسەکە نەناسراو و جێگای گومان بوایە[٢٠].

شارەزایانی حەدیس ئەوەندە رۆچووبوون لە بیرکردنەوەدا کە تاڕاددەیەکی سەرسوڕهێنەر راست و چەوتی فەرموودەکانیان دەزانی، دەتووت خوای گەورە ئیلهامیان بۆ دەنێرێ، کە ئەم جۆرە هێزەیان پاڵی پێوە دەنان کە هیچ فەرموودەیەك وەرنەگرن لەو کەسانەی کە فەرموودەی (غەریب) دەگێڕنەوە، بۆ نموونە کەسێکی وەکو موعەلای کوڕی هیلال کە زانیاری و فەرموودەیان لێ وەرنەدەگرت، نەلەبەر فاسقی بوو نە لەبەر بیرچوونەوە بوو، بگرە ئەوەندە خواناس بوو کە لە رۆژێکدا سەد رکات نوێژی دەکرد، بەڵکو وەکو خەتیبی بەغدادی دەفەرموێت: تەنها گێڕانەوەی حەدیسی (غەریب) ئەوی لەبەرچاوی زاناکان خستبوو، تاوەکو ئەوەندە رقیان لێی داگیرسا، ئەو پەڕاوەی کە فەرموودەکانی تێدا تۆمار کردبوو لە دەستیان راپسکان و خستیانە تەنوورێکەوە کە نێڵەنێڵ دەسووتا[٢١].

کەواتە پێشەوایانی حەدیس و شارەزایانی هەمیشە حەزیان لە گێڕانەوەی حەدیسە ناودارەکان و ناسراوەکان بووە، بەپێچەوانەی کۆلکە خوێندەوارەکانەوە، کە جوانترین حەدیس بە لایانەوە ئەوەبوو کە نەبیستراو بێت، دەگێڕنەوە کە بە زانای گەورە شوعبەی کوڕی حەجاجیان وت: بۆچی تۆ فەرموودە لە عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبی سولەیمانەوە[٢٢] وەرناگیرێت، لە کاتێکدا کە فەرموودەکانیشی لە جوانەکانن؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (ئاخر لەتاو جوانییەکانیانە کە لێیان رادەکەم)[٢٣].

لە راستییدا ئەو کەسانەی کە فەرموودەی (غەریب)یان دەگێڕایەوە، لە هەموو کەس زیاتر هەڵدەستان بە ئەنجامدانی جۆرەکانی تەدلیس لە گێڕانەوەکانیاندا، ئەوان بە دوای فەرموودەی نەبیستراودا دەگەڕان، نەك فەرموودەی راست و درووست، یان دەیانویست قسەکانیان بە

---

٢٠ الجامع لاخلاق الراوي، ١٢٧/٧.

٢١ بڕوانە ژیاننامەکەی لە (الجرح والتعديل) ٣٨٠/٨، (المجروحين) ١٦/٣، (ميزان الاعتدال) ٨٦٧٩.

٢٢ عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبی سولەیمانی عەزرەمی یەکێکە لە پێشەواکان و متمانەداریشە، بەڵام حەدیسێکی چەوتی لە شوفعەدا گێڕاوەتەوە کە رقی شوعبەی لێ هەستاندووە لەبەرئەوەی کەس نەیبیستبوو. لە ساڵی ١٤٥ك، کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ٤/ ٢٤٣، (تقريب التهذيب) ٥١٩/١.

٢٣ تهذيب التهذيب ٢٢٤/٤.

ئارایشێکی رووکەش و وشەی توێکڵاوی برازێننەوە، نەك بۆ ئەوەی کە فەرموودەیەك بهێنن کە خۆی لە خۆیدا ئەوەندە جوان و قەشەنگ بێت، هەموو ئارایشی جیهان لە ئاستیدا شەرمەزار بێت، جوان بووبێت بەوەی کە گومانی تیانەکرێت کە لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەرەوە و تێکەڵ بە هەناسەکانی ئەو پێمان گەیشتووە، جوان بووبێت بەوەی کە هەموو ئەوانەی دەماودەم گەیاندوویانە بە ئێمە کەسانی خاوەن متمانە و زانیاری و شارەزا بوون، بەراستی فەرموودەیەکی لەم جۆرە نەك هەر خۆی لە خۆیدا جوانە، بەڵکو کەسە گێرەرەوەکەشی و ئەو کۆرەش تیایدا گێرراوەتەوە و ئەو پارچە کاغەزەش کە تیایدا نووسراوەتەوە و ئەو کەسانەش کە گوێیان لێگرتووە هەر هەموویان بە جارێك جوان دەکات و دەرازێنێتەوە و بۆنخۆشیان دەکات.

مرۆڤی ژیر و دڵسۆز لە کاتێکدا بیر لەو کەسانە دەکاتەوە کە دزی و گزییان لە فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەردا دەکرد، ئەوا بە کوڵ گریانی بۆیان دێت، ئەوانە ئەوەندە گێل و نەفام بوون وایاندەزانی بەم کارانەیانەوە پۆز لێدەدەن و خۆیان دەنوێنن لەناو خەڵکاندا، نەیاندەزانی کە سەرەرای کامێرای خوایی کە بە دەنگ و رەنگەوە هەموو کاروبارێکیان تۆمار دەکات، بە هەر چوار دەوریشیاندا دەیان کامێرای شاراوە لە لایەن زانا بێ بەزەییەکانی حەدیسەوە کە رەحمیان بە باوکیشیان نەدەکرد لە ئامادەباشییانداو وێنەیان دەگرت، ئەوەبوو ئەوەی کە ئەوان شانازییان پێوە دەکرد بوو بە هۆی گاڵتە پێکردنی خەڵکی پێیان، هەروەها بە تۆمارکرنی ناوەکانیان لە لیستی رەشی ئەو کەسانەدا کە هێڵی راست و چەپ بەسەر ناوەکانیاندا هێنراوە و هیچ ئیعتبارێکیان بۆ دانانرێت، نە لە گوفتار و نە لە رەفتاردا و هەرچی دەڵێن دەدرێتەوە بەسەروچاویاندا.

بەراستی ئەو کارەی کە تەدلیسکەران لە حەدیسدا دەیانکرد لە پیسترینی ئەو کارانەیە کە مرۆڤ لەکەدار دەکات و کەسایەتی و متمانەی لای خەڵکی دەسرێتەوە، هەندێکیان زانیاری و فەرموودەی لە کەسێکەوە دەگێرایەوە کە وای دەردەخست لە دەمی خۆی بیستوویەتی، کەچی لە هەموو ژیانیشیدا چاوی پێی نەکەوتبوو، هەندێکیان کەسی وایان دەهێنا کە هەرگیز نەیاندەناسی، باسی وڵات و شار و گوندی وەهایان دەکرد کە گوایا گەشتیان بۆ کردوون و حەدیسیان لە زاناکانیان وەرگرتووە، کە تەنانەت لەسەر نەخشەی زەویش نەیاندەزانی

دەكەوێتە كوێوە، یان چەن سیفات و كردارێكی رازاوەی وایان دەدایە پاڵ مامۆستاكەیان كە هیچ پەیوەندییەكی پێیانەوە نەبوو[٢٤].

ئەو خزمەتە مەزنەی كە زانایانی ئیسلام پێشكەشی ئەم ئایینەیان كردووە، گەورەترین پشكی بەر قورئان و حەدیس كەوتووە، ئەوەندە بایەخیان بەو دوو لایەنە داوە كە جێگای سەرسوڕمانە، ئەوان دەربارەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (دووردی خوای لێ بێت) دەیان زانستیان داهێناوە، كە تا لێیان وردبیتەوە و بكۆڵیتەوە، زیاتر گرنگی و قەشەنگییان دەردەكەوێت، هەر جۆرە حەدیسێكیان جیاكردووەتەوە لە جۆرەكانی تر و بنەما و یاسای تایبەتییان بۆ داناوە، ئەوان كارەكەیان گەیاندووەتە هەرە لوتكەی بەرزی و دەگمەنە كەسێك بتوانێت چینێكی دیكەی لێ بنێت.

گەورەترین شانازی بەندەش، نووسەری ئەم چەند دێڕەش ئەوەیە كە هەر چۆنێك بێت خۆم كردووە بە پەرێزی ئەو كەڵە پیاوانەدا و لەو ناوەدا خەریكی هێشووكردنم، بەڵكو لەم لاو لەو لاوە گوڵە گوڵەیەك بدۆزمەوە و بیان كەم بە توێشوو و خۆراكی كاتەكانی نەهاتی و برسێتی.

لەم هەوڵە چكۆڵەیەدا ویستوومە پەروانە ئاسا هەندێك سەرەخولێ و باڵەتەپێ بكەم، بە دەوری یەكێك لە زانستەكانی حەدیسدا، كە ئەویش تەدلیسە لەلای زاناكانی حەدیس، ئەویش لە دووتوێی پێشەكییەك و سێ بەش و كۆتاییەكدا.

وا دیارە پێشەكییەكە پێویستی بە روونكردنەوە نەماوە، هەرچی بەشەكانیشە بڕیارە بەم شێوەیەی خوارەوە باسەكان لە ئەستۆ بگرن:

لە بەشی یەكەمدا مانای وشەی تەدلیس و جۆرەكانی لەگەڵ روونكردنەوەیان بە نموونەی واقیعی لە تۆماركراوەكانی شارەزایانی حەدیس، لە كاتێكدا كە بەشی دووەم تەرخان دەبێت بۆ روونكردنەوەی حوكمی هەریەكە لەو جۆرانەی تەدلیس و ریوایەتی تەدلیسكەر، لە كاتی ئەم باسەدا بە درێژیی رای زانایان دەربارەی وەرگرتنی حەدیسی ئەو كەسەی كە تەدلیسی لێ بینراوە و وەرنەگرتنی روون دەبێتەوە، بەڵام لە بەشی سێهەمدا باسی ئەو رێبازانە دەكرێت كە زانایان دۆزیویانەتەوە بۆ هەستكردن بە تەدلیس و دەستنیشان كردنی.

---

[٢٤] علوم الحديث ل١٧٣.

وا بزانكم كه رەفەكانی پەرتووكخانەی كوردی لە زانستەكانی حەدیسدا بە زمانی خۆمان نیمچە بەتاڵن، هەرچەندە لەم ساڵانەی دواییشدا هەندێ هەوڵی وەرگێڕان كراوە، بەڵام ئەوانە هینی حەدیسن نەك زانستەكانی، جا هیوادارم هەركەسێك لە خۆی رادەبینێ با لەم باخچەیەدا چەندە دەتوانێ نەمام بنێژێ و راستی ببێژێ.

تكاكارم لەو بەڕێزانەی كە ئەم نووسراوە دەخوێننەوە كە بە چاوی لێبوردنەوە تەماشای بكەن، جا ئەگەر بە جوان و پەسەندیان زانی با دووعایەكی خێر بكەن بە گەردنیدا و ئەگەر كەموكوڕییان هاتە پێش چاوان، با ببورن و چاوپۆشی بكەن و بە رەوشتی جوانی خۆیان هەوڵی پینەیەكی بۆ بدەن، چونكە كاری تۆكمە و بێ كەموكوڕی، بەس لە توانای خوای گەورەدایە، هەرئەویش پشتیوانی هەموان بێت.

**ئیبراهیم فەتاح**
**مامۆستای كۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەكانی**
**زانكۆی سلێمانی**

**١ـ ماناى تەدلیس:**

وشەی (تدليس)ی عەرەبی چاوگە بۆ کرداری چوار پیتی (دلَّس) کە لە بنەڕەتیشەوە، وەرگیراوە لە وشەی (الدّلَس) بە دال و لامی فەتحەدارەوە، کە ئەم وشەیەش بە مانای تەمومژ و تێکەڵ بوونی رووناکی لەگەڵ تاریکیدا دێت، پاشان گوێزراوەتەوە بۆ مەبەستی رووکەش کردنی شت، وەکو رووکەشکردنی ئامێرێکی مسینە بە زێڕ یان بە زیو، هەروەها بۆ مەبەستی شاردنەوەی عەیب و ناتەواوی لە کاڵاو شتومەکدا، عەرەب دەڵێن: (دلَّسَ في البيع) واتە عەیبی فرۆشراوەکەی لە فرۆشتنەکەدا شاردەوە[٢٥].

کەواتە لێرەدا زانرا کە وشەی تەدلیس بریتییە لە فڕوفێڵ و گزی کردن و شاردنەوەی عەیبی عەیبدار و پیشاندانی شتێکی کەمبایەخ لە شێوەی شتێکی بایەخداردا.

پەیوەندیی ئەم وشەیەش بە حەدیس و باسەکانیەوە ئەوەیە کە هەندێ لەو کەسانەی حەدیسیان گێڕاوەتەوە پابەندنەبوون بەو مەرجانەی کە زانایان دایان ناوە بۆ گێڕانەوەی فەرموودەکان و ویژدان و ئیمانیش داکۆکییان لەسەر دەکات، دەبینیت هەندێ جار سنووریان بەزاندووە و حەدیسی لاواز و عەیبداریان گێڕاوەتەوە کە بە لای زاناکانەوە، ئەگەر وەکو خۆی لە راستییدا چۆنە ئاوا بگێڕرایەتەوە، ئەوا ئەو حەدیسەیان وەرنەدەگرتن و دەیاندایەوە بەسەریاندا، لەبەرئەوە دێن راستییەکە دادەپۆشن لە شێوەیەکی جوان و پەسەندا دەیگێڕنەوە.

شێوازی ئەم جۆرە گۆڕینە و راستی داپۆشینە بە یارمەتی خوا لە باسی جۆرەکانی تەدلیسدا بە جوانی روون دەبێتەوە، بەڵام لێرەشدا هەر بۆ رەواندنەوەی گرێی دڵەکان ئاماژە بۆ دوو نموونە لە تەدلیس دەکەین.

وەکو دەزانین هەر فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەهۆی زنجیرەیەك لە گێڕەرەوەکانەوە پێمان گەیشتووە کە پێیان دەوترێت (رواة) کە ئەم کەسانە دەماودەم لە یەکترییان بیستووەو گێڕاویانەتەوە، بۆ ئەو کەسەی دوای خۆیان کە ئەم زنجیرەیە پێی دەڵێن (سند)، چونکە سەنەد و سەلمێنەرە بۆ حەدیسەکە، چونکە

---

[٢٥] لسان العرب، ج٣، ٦٤ (٢٢٤٨).

هەتا ئەو سەنەدە ڕێكوپێك بێت و كەسەكانی ناوی خاوەنی ئەو مەرجانە بن كە پێویستن بۆ گێڕەرەوانی حەدیس، ئەوا باشتر ڕاستیی فەرموودەكە دەسەلمێت و گومان و دوودڵی لێ دوور دەخاتەوە، هەروەكو سەنەدی تاپۆ بۆ سەلماندنی ڕاست و درووستی موڵكەكە، ئینجا مەرجێك لە مەرجەكانی باشی سەنەد ئەوەیە كە هەریەكێك لە كەسەكانی ناوی، بە گوێچكەی خۆی فەرموودەكەی لە دەمی ئەو كەسەی پێش خۆی بیستبێت، بەڵكو ئەمە یەكێكە لە پێنج مەرجەكانی حەدیسی صەحیح.

ئینجا لێرەدا یەكێك لەو كەسانەی ناو زنجیرەكە دێت فەرموودەكە دەگوێزێتەوە لە كەسێكەوە، كە لە ڕاستییدا خۆی ئەو كەسەی دیوە و بە خزمەتی گەیشتووە و لەوانەیە چەندان فەرموودەشی لێ وەرگرتبێت، بەڵام ئەم فەرموودەیەی ئێستای لەو نەبیستووە، بەڵكو لە كەسێكی تری بیستووە، كە ئەو كەسە لەو شێخەی بیستووە كەچی ئەم هات ئەو كەسەی تری نێوان ئەم و شێخەكەی لابردو و بەمە زنجیرەكە قرتا و پچڕانی تێ كەوت.

جا لێرەدا ئەم كەسە بەم كارەی دوو دیاردەی ناشیرینی ئەنجام دا، یەكەمیان زنجیرەی سەنەدی قرتاوی بە نەقرتاو پیشانی خەڵكی دا، دووەمیشیان بۆیە ئەم كارە دەكات، چونكە ئەو كەسەی كە لێی بیستووە و حەلقەی نێوان ئەم و ئەو شێخەیە كە ناوی بردووە، بۆیە لە زنجیرەكەی دەركردووە و ناوی نەهێناوە، چونكە ئەو كەسە لەلای زانایانی حەدیس لاوازە و متمانەی نییەو حەدیسی لێ وەرناگیرێت، كەواتە ئەم كەسە بەم كارەی گزییەكی نابەجێی ئەنجام دا و حەدیسێكی عەیبداری گومانایی خستە چوارچێوەی فەرموودەیەكی بێ عەیبی بێ گومانەوە، كەواتە پڕ بە پێستی خۆیەتی كە پێی بووترێت (تدلیس)، چونكە وەكو وتمان ماناكەی داپۆشینی عەیب و ڕووكەشكردنی شتێكی كەم بایەخە بە شتێكی بایەخدار.

نموونەیەكی تر لە تەدلیس كردن ئەوەیە كە تەدلیسكەر هیچ كەسێك لە زنجیرەی سەنەدەكەی لا نابات، بەڵام ناوی شێخەكەی خۆی بە ناوێك ئەهێنێ كە خەڵكان نەیناسنەوە، لەبەرئەوەش ئەمە دەكات چونكە كەسێكی لاوازە لە حەدیسدا، ئەگەر بزانن ئەم حەدیسە لەوەوە گێڕراوەتەوە ئەوا لێی وەرناگرن.

زانراوە كە ڕستەی (ما وراء النهر) هەر زۆر بە بڵاوی بەكارهێنراوە لە كتێبە مێژووییەكان و جوگرافییەكانی سەدەكانی پێشووی ئیسلامدا و مەبەستیشیان بە (نهر) لێرەدا ڕووباری

جەیحونە، کـە مەبەسـتیان بـە (مـاوراء النهـر) دیـوی ئەوبـەری ئـەو رووبارەیـە کـە هـەرێمی خۆراسـان دەگرێتــەوە، کەچـی لێـرەدا کەسـێك لەبـەرێك لـە دوو بەرەکـەی شـاری بەغـدا دانیشتووە بۆ نموونـە بڵـێین لـە کەرخـە، حەدیسێك لـە شـێخێکی لاواز و بـیٚ متمانـەوە لـە بەرەکەی تری شارەکەی دەگێڕێتـەوە، بـۆ نموونـە دەڵێـت: (حـدَّثني أبـو عبـدالله محمـد بـن سليمان بما وراء النهر) واتە: (ئەبوعەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی سولەیمان لـە ماوەرائەلنـەهر حەدیسی بۆ گێڕامەوە)، جا بزانن کە چۆن بەم دەربڕینە دوکەڵ و تەمومژی خستە بەرچاوی خەڵکان و بیٚ ئەوەی هەستیش بە ماندوێتی ئەو رێگا دوورودرێژە بکەن هەر لە یەك چرکەدا و یـەك چـەقەنە لـە (بەغـدا)وە فڕێـی دانـە نـاو (مـەرۆ)وە، چـونکە بمانـەویٚ و نەمانـەویٚ هەرکەسێکی بە ویژدان ئەم رستەیەی بیست بیری بۆ ئـەویٚ دەڕوات، چـوزانیٚ کـە مەبەسـت بەری رەسافەی بەغدایە کە با لە راستیـشدا ئـەمیش (مـا وراء) نـەهری دیجلـەش بێـت، ئـەو شوێنە بگرێتەوە کە شێخی فێڵبازەکەی لێیە کە دیارە بەم فێڵ و گزییـە خـەڵکانی چەواشـە کرد و سەری لێشێواندن، تاوەکو نەزانن ئەو شـێخە هـەر شـێخەکەی دانیـشتووی رەسـافەی بەغدایـەو بـەڵکو حەدیـسەکەی بـە سـاختە بخرێتـە ریـزی حەدیـسە راسـتەکانەوە، کەواتـە تەدلیسی کرد و عەیبی عەیبداری لە خەڵکی شاردەوە.

کاتێـك بــە وردی بیرێــك لــە دەربــڕین و رســتەکانی دەکەیتــەوە دەبینیــت جگــە لــە هەڵخەڵەتانـدنی خەڵکـەکان کـە رسـتەی (مـا وراء النهـر)ی بـەکارهێنا بـۆ شـوێنێك کـە هـیچ کەسـێك ئـەم نـاوە بـۆ ئـەو شـوێنە بـەکارناهێنیٚ، ئـەو کەسـە جۆرێـك لـە شـانازی کـردن و خۆهەڵکێشانی بیٚ بنەماشی بەسەر خەڵکەکەدا نواند، فێڵێکی تریشی لێکردن کە وایان زانـی جەنابی کەسـێکی دڵسۆزە بـە ئـایین و پەرۆشـی خزمـەتکردنی فـەرموودەکانی پێغەمبـەرە (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، لەبەرئـەوەش هەڵدەسـتێت بـە گەشـت و سـەفەرکردن بـەناو وڵاتــانی ئیــسلامیدا بــە مەبەســتی کۆکردنــەوەی حــەدیس، ئــەوەتا تەنانــەت لەگــەڵ دەوروبەریـشیدا گەیـشتووەتە خۆراسـان و بـە خزمـەتی شـێخ و زاناکـانی ئـەو هەرێمـەش گەشتووەو حەدیس لەوانیش دەگێڕێتەوە.

شایانی باسە، هەروەکو باسیش کرا وشەی (تدليس) یش کـەوا بـە مانـای گـزی کـردن و فڕوفێڵ و چەواشەکاری دێت، بەڵام ئەو کەسەی کە بـەم کـارە هەڵدەسـتێت پێـی دەوترێـت

(مدَّلِّس) لەسەر قەبارەی ئیسمی فاعیل، واتە بە میمی مەچموم و لامی مەکسوورەوە، بەڵام بەو حەدیسەی کە ئەم کارەی بەرامبەر ئەنجام دراوە دەوترێت (مدَّلَّس) بە قەبارەی ئیسمی مەفعول، واتە بە لامی مەفتوحەوە.

**٢ـ جۆرەکانی تەدلیس:**

کاتێك کە توێژەر بە ناو پەرتووکەکانی زانستی حەدیسدا دەگەڕێت و بە وردی و قووڵی رای زاناکان تێدەگات، دەبینێت کە هەندێ جیاوازی بەدی دەکرێت لە نێوانیاندا دەربارەی جۆرەکانی تەدلیس، بە جۆرێك کە کۆمەڵێکیان وا دەزانن کە تەدلیس دوو جۆری هەیە و کۆمەڵێکی دیکەیشیان بە سێ جۆری دەزانن، کە ئەمان هاتوون جۆرێکی سێهەمیشیان بەسەربەخۆیی بڕیارداوە کە بە لای کۆمەڵی یەکەمەوە ئەم جۆری سێهەمەش هەر سەر بە یەکێکە لە دوو جۆرەکە.

زاناو پێشەوای زانستی حەدیس ئیبنو سەلاحی کوردی شارەزووری[٢٦] و ئیبنو کەسیر[٢٧] و کۆمەڵێك لە زاناکان وا دەزانن کە تەدلیس دوو جۆرە، ئەوانیش (تدلیس الاسناد) واتە (تەدلیس) لەناو زنجیرەی گێڕەرەوەکاندا، ئەوی تریشیان (تدلیس الشیوخ) واتە تەدلیس بە گۆڕاندن و شێواندنی ناوی شێخەکە[٢٨].

---

[٢٦] ناوی عوسمانی کوڕی عەبدوڕەحمانی ئەبو عەمرە، زانایەکی بلیمەتی کوردە لە دێی شەرخان لە شارەزوور لە ساڵی ٥٧٧ك لە دایك بووە، بە پێشەوای هەموو زانایانی حەدیس لە دوای خۆی دادەنرێت، دانراوەکەی بەناوی (معرفة أنواع علوم الحديث) بووە بە چرایەك کە هەموو زانایان وەکو پەروانە بە دەوریدا خولاونەتەوە، نازناوی (شيخ الاسلام) پێبەخشراوە لە ساڵی (٦٤٣ك) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (البداية والنهاية) ١٦٨/١٣، (تذكرة الحفاظ) ١٤٩/٤، (شذرات الذهب) ٢٢١/٥.

[٢٧] ناوی ئەبو فیدا ئیسماعیلی کوڕی عومەری کوڕی کەسیرە، لە ساڵی (٧٠٠ك) لەدایك بووە، لە خزمەتی شێخی (میزی)دا پێگەیشتووە و کچیشی لێ خواستووە.

[٢٨] (التقييد والايضاح) ١/ ٤٤٦، (شذى الفياح)، ل٧٣، (الباعث الحثيث)، ل٤٥.

**بەڵام هەردوو حافیزی[29] گەورە عەبدوڕەحیمی[30] عێراقی کوردی ڕازیانی و جەلالودینی سیوگی[31] وا دەزانن کە تەدلیس سێ جۆرە، کە بە لای ئەمانەوە سەرەڕای ئەو دوو جۆرەی باسکران جۆرێکی تریش هەیە کە پێی دەوترێت (تدليس التسوية) واتە تەدلیس کردن بە ساف و بێ گرێ و گۆڵ کردنی زنجیرەی سەنەدەکەی[32].**

**شێخی عێراقی خوای لێ ڕازی بێت، هەر زۆر بە زەقی لە پەرتووکەکانیدا دەربارەی باس نەکردنی ئیبنو سەلاح بۆ جۆری سێهەمی تەدلیس دواوە، لەو شەرحەیدا کە لەسەر موقەدیمەکەی ئیبنو سەلاح نووسیویەتی بەناوی (التقييد والايضاح لما أطلق وأغلق من كتاب ابن الصلاح) لەسەر فەرموودەکەی شێخ کە دەفەرموێت: (تەدلیس دوو جۆرە) عێراقی خێرا**

---

[29] وشەی (حافظ) یەکێکە لەو نازناوانەی کە بۆ پیاوانی حەدیس بەکاردەهێنرێت، لەبەرئەوەی کە زۆر دووپات دەکرێتەوە لەم جۆرە باسانەدا پێم باشە بزانرێت مانای چییەو بۆ کێ بەکاردێت.

هەموو زانایان کۆك نین لە سەر مەعنایەك بۆ وشەی (حافظ)، زۆریان دەڵێن ئەمە نازناوی کەسێکە کە شارەزای هەموو حەدیسەکانی پێغەمبەر بێت (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئاگاداری سەنەدەکانیان بێت و هەر هەموو ئەو حەدیسانەی لەبەر بێت کە زاناکان کۆکن لە ڕاستییاندا، ئەوانەش کە دوودڵن تیایاندا.

حافیزی میزی دەفەرموێت: حافیز ئەو کەسەیە کە بە لای کەمەوە ئەو پیاوانەی کە پەیوەندییان بە حەدیسەوە هەیەو ئەیان ناسێت و ژیانیان ئاگادارە زیاتر بن لەوانەی کە نایان ناسێت. بڕوانە: (تدريب الراوي) ص١٤. (موسوعة علوم الحديث) ٢/٩ـ١٠.

[30] ناوی ئەبولفەزل، زەینەدین، عەبدوڕەحیمی کوڕی حوسەینە، یەکێکە لە لە زانا گەورەکانی کورد، باوکی خەڵکی گوندی ڕازیانەیە لە شارەزوور، لە کوردستانەوە چووە بۆ قاهیرە، لەوێ عەبدوڕەحیم لە ساڵی ٧٢٥ك لە دایك بووە، ڕێگای خوێندنی گرتووەو بووە بە یەکێك لە هەرە زاناکانی ئیسلام، ژیاننامەکەی لیپاو لیپە لە ستایش و ڕەزامەندی زانایان دەربارەی، شێخی عەسقەلانی یەکێکە لە خوێندکارەکانی ئەم کەڵە زانایە، لە مەککە و مەدینە و گەلێ شوێنی تریش وانەی حەدیسی وتووەتەوە، لە ساڵی ٨٠٦ك لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (ذيل تذكرة الحفاظ لأبي الفضل المكي) ٣/١٣٤، (ذيل تذكرة الحفاظ للسيوطي) ٣/٢٤٥.

[31] ناوی ئەبولفەزڵ جەلالودین عەبدوڕەحمانی سیوگییە، لە ساڵی (٨٤٩ك) لە قاهیرە لە دایك بووە، زانایەکی بلیمەتەو لە هەموو زانستییەکاندا دانراوی هەیە، دانراوەکانی لە (٨٠٠) دانراو تێپەڕی کردووە، وتراوە کە دوو سەد هەزار حەدیسی لەبەر بووە، لە ساڵی (٩١١ك) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (حسن المحاضرة) ١/١٨٨، (الضوء اللامع) ٤/٦٥، (شذرات الذهب) ٨/٥١.

[32] (التقييد والايضاح) ١/٤٤٦ و (فتح المغيث للعراقي)، ل٩٣.

دەفەرموێت: لە ڕاستییدا ئیبنو سەلاح جۆرێکی سێهەمی تەدلیسی باس نەکردووە، کە خراپترینی هەموو جۆرەکانێتی، پێی دەڵێن تەدلیسی تەسویە[٣٣].

هەروەها عێراقی لەو شەرحەشیدا کە ناوی ناوە: (فتح المغيث بشرح ألفية الحديث) کە لەسەر ئەلفییە حەدیسییەکەی خۆی نووسیویەتی، دەفەرموێت: تەدلیس سێ جۆرە، بەڵام ئیبنو سەلاح تەنها دوو جۆری باس کردووە[٣٤].

لەراستییدا کە مرۆڤ بیرێك لەم فەرموودە و بۆچوونانەی شێخی عێراقی دەکاتەوە سەرسامی دایدەگرێت، چۆن ئەم ڕایەی بەم جۆرە بەرامبەر ئیبنو سەلاح دەربڕیوە؟ تۆ بڵێی ئەم ئیمامە گەورەیە کە بە پێشەوای هەموو زانایانی زانستی حەدیس لە دوای خۆی دادەنرێت، ئەم جۆرەی سێهەمی تەدلیسی نەبیستبێت و نەیزانی بێت؟ بەڵکو ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بزانرێت ئەوەیە کە ئیبنو سەلاح و هەموو ئەوانەش کە لەسەر ڕاکەی ئەون تەدلیسی تەسویەیان پشتگوێ نەخستووە و باسیان کردووە، تەنها ئەوەیە کە ئەوان ئەم جۆرەیان بە جۆرێکی سەربەخۆ دانەناوە، بەڵکو لە وێنەیەك لە وێنەکانی تەدلیسی ئیسنادیان ئەژمار کردووە؟

شێخی گەورەی حەدیس، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی[٣٥] خوای لێ ڕازی بێت، کە قوتابی عێراقی–یشە دەربارەی ئەم باسە پارێزگارییەکی بەهێزی لە ئیبنو سەلاح کردووەو

---

[٣٣] (التقييد والايضاح) ١/٤٤٦.

[٣٤] (فتح المغيث للعراقي)، ل٩٣.

[٣٥] سیوطی دەربارەی دەفەرموێت: ئیبنو حەجەر، شێخی ئیسلام و پێشەوای هەموو حافیزانی زەمانی خۆی، بەڵکو پێشەوای زانایانی هەموو جیهان بە گشتی شەهابودین ئەبولفەزل ئەحمەدی کوڕی عەلی عەسقەلانییە، لە ساڵی (٧٧٣ك) لە دایك بووە، ئاوی زەمزەمی خواردووەتەوە، بە ئاواتی گەیشتن بە پلەی حافیزی زەهەبی و پێشی گەیشت و لێشی تێپەڕی، لە خزمەتی شێخی عێراقیدا خوێندنی تەواوکردووە، لەکاتی سەرەمەرگدا لە عێراقییان پرسی: کێ هەڵدەبژێری بۆ جێنشینی خۆت؟ فەرمووی: ئیبن حەجەر، پاشان ئەبو زورعەی کوڕم، پاشان هەیسەمی. چەن دانراوێکی هەیە، لەسەروو هەموویانەوە، شەرحە نایابەکەیەتی لەسەر صەحیحی بوخاری بەناوی (فتح الباري) کە نە پێش خۆی و نە دوای خۆی وێنەی نەنووسراوە، لە ساڵی (٨٥٢ك) لە قاهیرە مردووە و لە ژێر فرمێسکی ئاسماندا لە ڕۆژێکی سایەقەی سامالدا کە دەڕژا بەسەر تەرمەکەیدا، بە خاك سپێردرا. بڕوانە: (ذيل تذكرة الحفاظ للسيوطي) ٣/٢٥١، (الدر الكامنة) ٤/ ٤٩٢، (الضوء اللامع) ٢/٣٦.

دەربارەی ڕەخنەکەی مامۆستای دەفەرموێت: "ئەم قسەیە بەرچاوتەنگییەکی تێدایە، لەبەرئەوەی ئیبنو سەلاح تەدلیسی کردووە بە دوو بەشەوە، یەکێکیان تەدلیسی ئیسنادە و ئەویتریشیان تەدلیسی شیوخە، تەسویەش ئەگەر گریمان تەدلیسیش بێت ئەوا بەشێکە لە بەشەکانی نموونەی یەکەم، کەواتە شێخ جۆری سێهەمی واز لیّ نەهێناوە، بەڵکو بەشێك لە بەشەکانی جۆری یەکەمی باس نەکردووە[٣٦].

ئینجا با یەکە یەکە جۆرەکانی تەدلیس بناسێنین:

**جۆری یەکەم پێی دەوترێت (تدليس الاسناد):**

لە فەرموودەکانی زانایانی حەدیسەوە دەردەکەوێت، کە ئەم جۆرە تەدلیسە چەن وێنەیەکی هەیەو لەسەر چەن شێوازێك دەکرێت، کە ئەو وێنە و شێوازانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١ـ وەکو ئەوەی کە تەدلیسکەر فەرموودە بگێڕێتەوە لە شێخێکەوە، کە بینیویەتی و فەرموودەشی لیّ بیستووە، بەڵام ئەم فەرموودەیەی ئێستای لەو نەبیستووە، بە جۆرێك دووا بێت کە خەڵکی وا بزانن کە لەو شێخەی بیستووە[٣٧].

واتە ئەم لە کەسێکی تری بیستووە، کە ئەو کەسە لەو شێخە باسکراوەی بیستووە، بەڵام ئەم ئەو کەسەی نێوانیانی لە زنجیرەکە سڕیوەتەوە، جا ڕیّ دەکەوێت، کە لە نێوان ئەم و شێخەکەدا کەسێك لابرابێت، یان زیاتر لە کەسێك.

---

٣٦ (النكت) ٢/٢١٦.

٣٧ (التقييد والايضاح) ١/٤٠٥، (الشذى الفياح، ل٧٣).

زانای گەورەی حەدیس شێخی ئیبنو عەبدولبەڕی ئەندەلوسی[٣٨] لە شەرحە نایاب و بێوێنەکەیدا لەسەر مووەتەئی ئیمامی مالیك خوایان لیٚ رازی بێت کە ناوی ناوە (التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد) لە تەدلیس دوواوە و وادیارە کە بە لای ئەوەوە تەدلیسی راستی بەس ئەوەیە کە لەم وێنەیەدا دەبینرێت، لە برگەیەکی تەوکیداویدا دەفەرموێت: (تەدلیس ئەوەیە کە پیاوێك حەدیس بگێڕێتەوە لە شێخێك کە بینیویەتی و هاوچەرخی بووە، زانیاریی لێوەرگرتووە و فەرموودەشی لیٚ بیستووە و لێشی گێڕاوەتەوە ئەم پیاوە بێت بیگێڕێتەوە لە شێخێکی ئاوەها، حەدیسێك کە لەوی نەبیستووە بەڵکو لە کەسێکی تری بیستووە، کە ئەو کەسە لەو شێخەی بیستووە، واتە حەلقەی نێوانی خۆی و ئەو شێخەی باس نەکردووە، جا کەیفی خۆیەتی ئەو کەسە لابراوە جێگای متمانە بێت یان نا، کە زۆربەی کات لەوانەیە جێگای متمانە نەبێت، چونکە ئەگەر جێگای رەزامەندی خەڵکی بوایە باسی دەکرد و ناوەکەی لە ناواندا نەدەسڕییەوە)[٣٩].

شایانی باسیشە کە تەدلیسکەر نابێت ئەم فەرموودەیە بداتە پاڵ ئەو شێخەی کە لێی نەبیستووە، بە وشەیەك کە بیستن بگەیەنێت، وەکو ئەوەی بڵێت (سمعتُ) یان (حدَّثني) یان وێنەی ئەمانە، بەڵکو دەبێت بە وشەیەك بیداتە پاڵی کە گومانی لیٚ بیستنی لیٚ بکرێت، وەکو (عن فلان) یان (حدَّث فلان) یان (قال فلان) یان وێنەی ئەمانە[٤٠].

بۆ روونکردنەوەی ئەم جۆرە تەدلیسە ئیمامی ئیبنو سەلاح نموونەیەکی هێناوەتەوە، کە دوای خۆشی سەرجەم زانایان لە نووسراوەکانیاندا دووپاتیان کردووەتەوە، ئیمام دەفەرموێت: وێنەی ئەم تەدلیسە، وەکو ئەو حەدیسەی کە گێڕاومانەتەوە لە عەلی کوڕی

---

[٣٨] ناوی عەبدولبەڕ ئەبوعومەر، یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولبەڕە، یەکێکە لە زانا بلیمەتەکانی قورتوبە، لە ئەندەلوس بە شێخی ئیسلام ناسراوە. لە ساڵی (٣٦٨ك) لە دایك بووە و خوێندوویەتی تاوەکو بووە بە تاکەکەی سەردەمی خۆی لە زانیارییە ئیسلامییەکاندا، ئەو شەرحەی کە لەسەر کتێبەکەی ئیمامی مالیك نووسیویەتی زانایان لە بەهێزی و بە پیٚزیدا بەبیٚ وێنەی دەزانن، لە ساڵی (٤٦٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (وفيات الاعيان) ٦٦/٧، (سير أعلام النبلاء) ١٥٣/١٨، (دول الاسلام) ٢٧٣/١.

[٣٩] (التمهيد) ١٩/١.

[٤٠] (فتح المغيث للعراقي) ل٩٣، (موسوعة علوم الحديث) ٤٠١/١.

**خەشـرەمەوە[٤١] کـە فەرموویـەتی لـە خزمـەتی سـوفیانی کـوڕی عوییـنـە[٤٢] دا بـووین کـە حەدیسی بۆ دەگێڕاینەوە، سوفیان فەرمووی: زوهـری فەرموویـەتی: پێیـان وت: زوهـری[٤٣] خۆی حەدیسەکەی بۆ گێڕایتـەوە؟ بێـدەنگ بـوو، پاشـان فـەرمووی: زوهـری فەرموویـەتی، وتیان لە زوهری خۆیت بیستووە، فەرمووی نـەخێر، لـە زوهـریم نەبیـستووە، لـەو کەسەشـم نەبیستووە کە لە زوهری بیـستووە، بـەڵکو مـن لـە عەبـدوڕەزاقم[٤٤] بیـستووە و ئـەویش لـە مەعمەر[٤٥] و ئەویش لە زوهری بیستووە[٤٦].**

**کەواتە لێرەدا سوفیان تەدلیسی کـرد و نـەك کەسـێکیش بگـرە دوانیـشی لـە زنجیرەکـە بەدەر کرد، لەگەڵ ئەوەشدا بە جۆرێك فەرموودەکـەی بـۆ قوتابییـەکانی دەگێڕایـەوە کـە وا دەزانرا فەرموودەکەی لە زوهری خۆی بیستووە.**

---

[٤١] عەلی کوڕی خەشرەم، ئەبو حەسەنی حافیز، یەکێکە لە پێشەوا گەورەکانی حەدیس و مامۆستای موسلیم و ترمیزی و نەسائی بووە، لە ساڵی (١٦٥ك) لە دایك بووە و لە (٢٥٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعدیل) ١٨٤/٦ و (تهذیب التهذیب) ٥٩٣/٤ (٥٥٤٥).

[٤٢] سوفیانی کوڕی عویینە یەکێکە لە هەرە هەڵکەوتووانی زانستی حەدیس، شافیعی دەیفەرموو: ئەگەر مالیك و سوفیان نەبوونایە ئەوا زانیاری وڵاتی حیجاز لەناودەچوو، لە ساڵی (١٠٧ك) لە دایك بووەو لە (١٩٨ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب التهذیب) ٧٢٠/٢ (٢٨٧٨) (تقریب التهذیب) ١/ ٣١٢.

[٤٣] زوهری، موحەممەدی کوڕی موسلیمی کوڕی عوبەیدوڵڵای زوهرییە، تابیعییەکی گەورەیە و یەکێکە لە زانا پایەبەرزەکانی وڵاتی حیجاز و شام، لە ساڵی (٥٠ك) لە دایك بووەو لە (١٢٣ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (الجرح والتعدیل) ٣١٨/٨، (تهذیب التهذیب) ٤٨/٦، (٧٤٣٧).

[٤٤] عەبدوڕەزاقی کوڕی هومامی کوڕی نافیعی حیمیریە، یەکێکە لە شارەزا گەورەکانی حەدیس، لە ساڵی (١٢٦ك) لە دایك بووەو لە (٢١١ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب التهذیب) ١٦٧/٤ (٤٧٦١)، (تقریب التهذیب) ٥٠٥/١.

[٤٥] مەعمەری کوڕی راشیدی ئەزدی ئەبو عوروە، کەسێکی ئاگادار و رێزدار و دیندار بووە، شارەزاترین کەسە لە حەدیسەکانی زوهریدا، لە ساڵی (١٥٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعدیل) ١١٦٥/٨، (تهذیب الکمال) ٢٨/ ٣٣، (تهذیب التهذیب) ٦/ ٣٦٣ (٨٠٣٥).

[٤٦] (التقیید والایضاح) ٤٥٠/١، (اختصار علوم الحدیث) ل٥٨، (الشذی الفیاح) ل٧٣.

**٢ـ وێنەیەکی تر لە تەدلیسی ئیسناد ئەوەیە، کە تەدلیسکەر فـەرمووده دەگێڕێتـەوە لـە کەسـێکەوە کـە هاوچـەرخی خـۆی بـووە، بـەڵام هـەرگیز نـەیبینیوە و بـە جۆرێـك باسـەکە دەکـات، کـەوا دەزانرێـت ئـەو کەسـەی بینیـوە و فەرموودەشـی لـە خـۆی وەرگرتـووە و بیستووە[٤٧].**

**نموونەی ئەمەش وەکو ئەوەی کە شێخی گەورەی حەدیس، حافیز زەهەبی[٤٨] خوای لێ ڕازی بێت، لە ژیاننامەی سەعیدی کوڕی ئەبی عوروبەدا[٤٩] دەفەرموێت: سەعید یەکێك بووە لە تەدلیسکەران و ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل[٥٠] دەربـارەی فەرموویـەتی: سـەعیدی کـوڕی ئەبی عوروبە هیچ حەدیسێکی نە لە حەکەم[٥١] نە لە ئەعمەش[٥٢] نـە لـە حـەمماد[٥٣] نـە لـە**

---

٤٧ (الشذى الفياح) ل٧٣.

٤٨ پێشەوای گەورەی زانیارییەکانی حەدیس، شەمسودینی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی زەهەبییە، خۆی لە خۆیدا بە قوتابخانەیەکی زانستی ڕەخنە و مێژووی پیاوانی حەدیس دەناسرێت، زاناکانی دوای خۆی لەسەر خوانی لاپەڕەکانی پەرتووکەکانی ئەم تا قرقێنەدانەوە خۆیان تەسەل کردووە، کەسێکی وەکو عەسقەلانی بە ئاواتەوە بووە کە بگاتە پلەکەی ئەم، لە ساڵی (٧٤٨ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (سير أعلام النبلاء) ١٢/١، (تذكرة الحفاظ).

٤٩ سەعیدی کوڕی ئەبی عوروبە مەهرانی عەدەوی کەسێکی متمانەداربوو، بەڵام پێنج ساڵ پێش مردنی خەڵەفا بوو، لە ساڵی (١٥٥ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الكاشف) ٣٦٨/١، (تهذيب التهذيب) ٦٧٠/٢ (٢٧٨٢).

٥٠ ئەحمەی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنبەلی شەیبانی بەغدادی، یەکێکە لە زانا بەرزەکانی حەدیس و لە چوار ئیمامە گەورەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە و ستایشی لە ئەژمار نایەت، شافیعی دەفەرموێت: کە بەغدام بەجێهێشت لە ئەحمەدم زاناتر و شەرعزانتر و واریعتر و زاهیدترم تێدا بەجێ نەهێشت، لە ساڵی (٢٤١ك) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ١٧١/٢ (١٧٢٤)، (تقريب التهذيب) ١٩٢/١.

٥١ مەبەستی حەکەمی کوڕی عوتبەی کیندییەو متمانەدارە، لە ساڵی (٥٠ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (١١٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ١٧١/٢ (١٧٢٤)، (تقريب التهذيب) ١٩٢/١.

٥٢ ئەعمەش ناوی سولەیمانی کوڕی مەهرانە، زەهەبی ستایشێکی زۆری لەسەر کردووە و بە شێخی ئیسلام ناوی بردووە، لە ساڵی (١٤٨ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ١٠٦/٨ (٢٥٥٣) و (الكاشف) ٢٥٣/١ (٢١٥١).

٥٣ حەممادی کوڕی سولەیمان ئەبو ئیسماعیلی کوفی، ڕاستگۆیە، بەڵام شتی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە، لە ساڵی (١٢٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الكاشف) ٢٥٢ و (الجرح والتعديل) ٦٤٤/٣.

**عەمری کوڕی دینار[٥٤]، نە لە هیشامی کوڕی عوروە[٥٥])... و ناوی کۆمەڵێکی تریشی هێناوە و پاشان فەرموویەتی: (لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ لەم کەسانەی نەبیستووە، بە تەدلیس حەدیس لە هەموویانەوە دەگێڕێتەوە[٥٦].**

**واتە ناوی ئەو کەسە نابات کە حەدیسەکەی لەم شێخانە بیستووە و هاتووە بۆ ئەمی گێڕاوەتەوە.**

**ئەم دوو وێنەیەی باسکران، ئیمامی ئیبنو سەلاح لە باسی تەدلیسی ئیسناددا دانی بە هەردووکیاندا ناوە و بە تەدلیسی داناون، بەڵام ئەوەی کە لە فەرموودەی هەندێ لە زانایانی حەدیسەوە دەردەکەوێت ئەوەیە کە بە وێنەی دووەم دەوترێت (ئیرسال)[٥٧] نەك تەدلیس، چونکە مەرجی تەدلیس ئەوەیە کە حەدیسێك بگێڕیتەوە لە کەسێك کە ئەو حەدیسەی لێ نەبیستووە، بەڵام دەبێت حەدیسی تری جگە لەمەی لێ بیستبێت و بووبێت بە شێخ و مامۆستای، چونکە کاتێك خەڵکان هەڵدەخەڵەتێن بە تەدلیس کردن کە دێت حەدیس لە کەسێکەوە دەگێڕێتەوە کە شێخ و مامۆستایەتی و خەڵکان ئەمە دەزانن و لەبەرئەوە بە هەڵەدا دەچن و دەڵێن: دیارە قوتابییەتی و ئەمەشی هەر لەو بیستووە و بۆ ئەوە ناچن کە کەسێك لە زنجیرەکەدا بووە و لابراوە، کە ئەم حاڵەتە بە ئاشکرا لە وێنەی یەکەمدا بینرا، بەڵام ئەگەر لە کەسێکەوە فەرموودەی گێڕایەوە کە نە دیویەتی و نە هیچیشی لێ بیستووە، ئەوا کارەکەی نابێت بە تەدلیس، چونکە زاناکان هەموو دەزانن کە ئەم قوتابی ئەو نییەو نابێت خۆی ئەم فەرموودەیەی لەو بیستبێت، بەڵکو دیارە کەسێك بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو کەسە لەو شێخە ناوبراوەی بیستووە.**

---

[٥٤] عەمری کوڕی دیناری مەککی، ئەبومحەممەدی جومەحی، تابیعییەکی گەورەیە و یەکێکە لە شکۆدارەکانی حەدیس، لە ساڵی (١٢٦ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ٥/٢٢ و (تهذیب التهذیب) ٢٥/٥ (٥٩٠٥).

[٥٥] هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبەیری ئەسەدی تابیعییە، یەکێکە لە گەورە زاناکان، لە ساڵی (١٤٦ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الکاشف) ٢٢٣/٣، (تهذیب التهذیب) ٦٤٩/٦ (٨٥٧٥).

[٥٦] (سیر أعلام النبلاء) ٤١٥/٦.

[٥٧] لەمەودوا بە پشتیوانی خوا هەر لەم نووسراوەدا پێناسەی ئیرسال دەکەین و رای زانایانی تێدا روون دەکەینەوە.

لام وابێت لێرەدا جیاوازی لە نێوان تەدلیس و ئیرسالدا روون بووەوە، کە لە هەردووکیاندا کەسێك یان زیاتر لە زنجیرەی سەنەدەکە لا دەبرێت، بەڵام کەسی دوای کەسە لابراوەکە ئەگەر شێخ و مامۆستای کەسەکەی پێشی بێت ئەوە کردارەکە تەدلیسە، ئەگەر هی دواوەی مامۆستای ئەوەی پێشەوەی نەبوو ئەوە ئیرسال دەبێت.

ئەم تیشکەی کە خرایە سەر فەرموودە و بۆچوونەکەی ئیبنو سەلاح و باسکردنی جیاوازی لە نێوان تەدلیس و ئیرسالدا لە لایەن شێخی عێراقیی و گرووپێك لە حافیزانی حەدیس وەکو شێخی بەزاز[٥٨] و ئیبنو قەتتان[٥٩] و چەند کەسێکی تریشەوەیە، پاشان شێخی عەسقەلانیش پشتگیریی کردوون[٦٠].

بەڵام ئەوەی راستی بێت بە ماوەیەکی گەلێ زۆر لە پێش ئەمانیشدا ئیبنو عەبدولبەڕ لەم باسەی کۆڵی بووەوە و لە تەمهید دا راستییەکەی روون کردبۆوە کە دەفەرموێت:

"زانایان ڕای جیاجیایان هەیە دەربارەی حەدیسی مرۆڤێك کە گێڕاویەتییەوە لە کەسێکەوە کە نەیبینیوە، وەکو مالیك لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە، یان سەوری لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، وێنەی ئەمانە، لێرەدا هەندێك دەفەرموون: ئەم کارە تەدلیسە، چونکە ئەگەر ئارەزوویان بکردایە ناوی ئەو کەسەیان دەبرد کە فەرموودەکەی لەوانەوە بۆ گێڕاونەتەوە، وەکو لە زۆربەی ئەو حەدیسانەدا کردوویانە، کە لەو دوو شێخەوە پێیان گەیشتووە و ناوی کەسەکەی نێوانیانیان بردووە.

کەواتە هەرکاتێك مرۆڤ بێدەنگ بوو لە ناوبردنی ئەو کەسەی کە فەرموودەی لێ بیستووە ئەوە بە تەدلیسکەر دادەنرێت"[٦١].

---

[٥٨] شێخی زەهەبی ستایشێکی زۆری بەززازی کردووە و بە (علامة) ناوی بردووە، لە ساڵی (٢٩٢ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تأريخ بغداد) ٣٤٤/٤ وە (تذكرة الحفاظ) ١٦٦/٢، (لسان الميزان) ٣٧/١.

[٥٩] ئیبنو قەتتان ناوی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیکە، یەکێکە لە هەرە شارەزایانی ئەم بوارە، لە ساڵی (٦٢٨ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تذكرة الحفاظ) ١٣٢/٤، (سير أعلام النبلاء) ٣٦٠/٢٢، (شذرات الذهب) ١٢٨/٥.

[٦٠] (التقييد والايضاح) ٤٥١/١، (فتح المغيث للعراقي) ل٩٤، (النكت) ٦١٤/٢، (فتح المغيث للسخاوي) ١٧٠/١.

[٦١] التمهيد، ١٩/١ـ٢٠.

بەڵام وا دیارە کە شێخی ئیبنو عەبدولبەڕ (خوای لێ رازی بێت) خۆی لەگەڵ ئـەم رایـەدا نییـە و هـەرگیز بێـدەنگبوونی گێـڕەرەوەی حـەدیس لـە نـاوبردنی شـێخەکەی بـە تـەدلیس دانانێ، بەڵکو ئەم کارە بە ئیرسال دەزانێ، ئینجا لێرەدا ئەم ئیمامە مەزنـە فەرموودەیـەکی زۆر جـوانی وەکـو بەڵگەیـەك بـۆ دروسـتی بۆچـوونەکەی خـۆی فـەرمووە، کـە زۆربـەی سەرچاوەکانی دوای خۆی دووپاتیـان کردووەتـەوە، ئـەو دەربـارەی ڕای ئـەم زانایانـەی کـە هەموو بێدەنگییەکی بە تەدلیس دادەنێن، دەفـەرمووێت: "لـە راسـتییدا ئەگـەر ئـەم جـۆرە بێدەنگییە بە تەدلیس دابنرێت، ئەوە باوەڕناکەم کەسێك هەبێت لە زانا بەرزەکانیش کە لەم جۆرە بێدەنگییە رزگاری بووبێت چ لە ئیمامەکانی زوو چ لـە تازەکـانیش، تەنانـەت ئیمـامی مالیك و هاووێنەکانیشی مەگەر تەنها دوو کەس نـەبێت کـە بەرنەکـەون، ئـەوانیش شـوعبەی کـوڕی حـەججاج و یـەحیای کـوڕی سـەعیدی قـەتتان، چـونکە ئـەم دوو ئیمامـە هـەرگیز بێدەنگییان لەناوبردنی شێخەکانیان نەکردووە"[٦٢].

٣- وێنەیەکی تر لە تەدلیسی ئیسناد ئەوەیە کە تەدلیسکەر فەرموودەکـە بگێڕێتـەوە لـە شێخێکەوە کە نە هاوچەرخی بووە و نە بینیویشێتی، بە مەرجێك گێڕانەوەکەی بەشـێوەیەك بێت کە خەڵکان چەواشە بکات و وابزانن کە شێخەکەی بینیوە.

نموونەی ئەم جۆرەش وەکو ئەوە کە ئیبنـو حیبـانی بوسـتی دەربـارەی عەبدولجـەباری کوڕی وائیلی کوڕی حەجـەر فەرموویـەتی: "کاتێـك بـاوکی مـردووە، ئـەم لـە سـکی دایکیـدا بووە، کەواتە هەر شتێك لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە هەمووی تەدلیسە".

هـەروەها ئـەم رایـەی ئیبنـو حیبـان رای ئیمـامی بوخـاری و چـەند کەسـێکی تریـشە دەربارەی عەبدولجەبار[٦٣].

لەراستییدا فەرموودەکەشیان بەجێیە، چونکە مادام لە کاتی مردنی باوکیدا ئەم لە سکی دایکیدا بووبێت نابێت هیچ شتێکی لە دەمی باوکییەوە بیستبێت، بەڵکو دەبێت کە کەسێکی

---

٦٢ (التمهيد) ٢١/١ و (التقييد والايضاح) /٤٥١.

٦٣ (تهذيب التهذيب) ٣/ ٢١، (موسوعة علوم الحديث) ٤٤٩/١، بە وەرگرتن لە (مشاهير علماء الامصار) ١٦٣/١.

تـر هـەبێت لـە نێوانیانـدا کـە بـاوکی ئـەمی نـەدیوە و فـەرموودەکانی لـە باوکییـەوە بـۆ گێڕاوەتەوە، کەچی ئەم ناوی ئەو کەسەی نێوانیان نابات و هەر دەڵێت: باوکم فەرمووی.

لە راسـتییدا ئـەم تەدلیـسەی عەبدولجـەبار نموونەیـەکی ترسـناکە لـە تـەدلیس کردنـدا، چونکە لەوانەیە شێخێك بـۆ شـێخێك لـە هەنـدێ جـاردا گومـانی تەدلیـست لا دروسـت ببێـت دەربارەیان، بەڵام گێڕانەوەی کوڕ لە باوکەوە هەر ئاساییەو باوەڕ ناکرێت کەسێك ببێـت بـە بیریا بێت کە کەسێك ببێت لە نێوانیاندا.

٤ـ وێنەیـەکی تـر لـە تەدلیـسی ئیـسناد ئەوەیـە کـە تەدلیـسکەر لـە پـەڕە و نووسـراوی شێخێکەوە فەرمووده دەگێڕێتەوە کە هاوچەرخی خۆیـەتی، ئـیتر دیبێتـی یـان نـەی دیـبێ، بەڵام بە مەرجێك قسەکانی وا بکات کە خەڵکی چەواشە بکـات و وابـزانن لـە شـێخەکە خـۆی بیستووە[٦٤].

دەتـوانین نموونـەش بـۆ ئـەم جـۆرە تەدلیـسە بـەوە بهێنینـەوە کـە هـەر ئیبنـو حیبـان فەرموویەتی، دەربارەی گرووپێك لەو کەسانەی کە تەفسیریان لە ئیمـامی موجاهیـد[٦٥] ەوە گێڕاوەتەوە و لە کاتێکیشدا کە لە خۆیان نەبیستووە، بەڵکو لە کەسێکیان بیستووە کە ئـەو لە موجاهیدی بیستووە و هاتووە بۆ ئەمانی گێڕاوەتەوە، کەواتە کارەکـە بـوو بـە تـەدلیس، ئیبنو حیبان دەربارەی ئەم باسە دەفەرموێت: "هیچ کەسێك جگە لـە قـاسمی کـوڕی ئـەبی بـەزە[٦٦]، تەفـسیری لـە موجاهیـدەوە نەبیـستووە، کەچـی هەریـەکێك لـە حەکـەمی کـوڕی

---

[٦٤] موسوعة علوم الحديث ١/٤٥٠.

[٦٥] موجاهیدی کوڕی جەبری مەککی، ئەبولحەجاج، تابیعییەکی گەورەیە، سی کەڕەت (٣٠) هەموو قورئانی پیرۆزی بۆ ئیبنو عەبباس دەورکردووەتەوە، لە ساڵی (٢١ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٠٣ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (الجرح والتعديل) ١٤٦٩/٨، (تهذيب الكمال) ٢٢٨/٢٧، (تهذيب التهذيب) ١٧٤/٦ (٧٦٦١).

[٦٦] ناوی قاسمی کوڕی نافیعی مەککییە، لە ساڵی (١٣٤ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ١٣٦/١٥، (الكاشف) ٣٧٤/٢ (٤٥٥٥). (الجرح والتعديل) ١٤٦٩/٨، (تهذيب التهذيب) ٢٨٧/٥ (٦٤٢٧)، (تقريب التهذيب) ١١٥/٢.

**عوتەیبە[٦٧] و لەیسی کوڕی ئەبی سولەیم[٦٨] و ئیبنو ئەبی نەجیح و[٦٩] ئیبنو جورەیج[٧٠] و ئیبنو عویەینە[٧١] تەماشای پەرتووکەکانی قاسمیان کردووە و وێنەیان لەبەر نووسیوەتەوە و پاشان بەبێ ئەوەی ناوی قاسم بەرن راستەوخۆ تەفسیرەکە لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە[٧٢].**

**شایانی باسە حاکیمی نەیسابووری[٧٣] لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی و پشکنینێکی وردی دەربارەی وڵاتانی ئیسلامی کردووە، تاوەکو بزانێت کام وڵاتانە بە زۆری ئەم جۆرە تەدلیسە دەکەن و کام وڵاتانەش خۆ بەدوور دەگرن لەم جۆرە درۆ و گزی و فرِوفێڵ کردنە لە گێڕانەوەدا، پاشان بۆی دەرکەوتووە کە وڵاتی حیجاز و بە تایبەتی هەردوو شاری پیرۆزی مەککە و مەدینە و وڵاتانی میسر و عەوالی و خۆراسان و ئەسفەهان و خوزستان و ماوەرائونەهر، یەك ئیمامیان تێدا دەست ناکەوێت کە تەدلیسی کردبێت، بەڵکو زۆربەی ئەو زانایانەی کە تەدلیسیان لە حەدیسدا کردووە، دانیشتوانی شاری کوفە بوون و چەن کەسێکی کەمیش لە شاری بەسرە دەربارەی شاری بەغدایش وا زانراوە کە زاناکانی**

---

٦٧ حەکەمی کوڕی عوتەیبە ئەبو موحەممەدی کیندی کوفی، خواناس و متمانەدارە، لە ساڵی (١١٥ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (سیر أعلام النبلاء) ٥/٢٠٨، وە (الكاشف) ١/٢٠١ (١١٩٣).

٦٨ لەیسی کوڕی ئەبی سولەیمی کوڕی زەنیم، ئەبوبەکری کوفی زانا و خواناس بووە و هەندێ لاوازی تێدایە، لە ساڵی (١٤٨ك) کۆچی دوایی کردووە، (سیر أعلام النبلاء) ٦/١٧٩، (الكاشف) ٢/٤٠٥ (٤٧٤١).

٦٩ إبن أبي نجيح

٧٠ ئیبنو جورەیج عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبی سولەیمان ئەبولوەلید تابیعییە و ستایشێکی زۆری کراوە، لە ساڵی (١٥٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تذكرة الحفاظ) ١/١٢٧، (تقريب التهذيب) ١/٥٢٠.

٧١ مەبەستی سوفیانە.

٧٢ (تهذيب التهذيب) ٥/ ٢٨٧، (موسوعة علوم الحديث) ١/٤٥٠.

٧٣ ئەبو عەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای نەیسابووری، خاوەنی کتێبی موستەدرەك، لە ساڵی (٣٢١ك) لە دایك بووەو لە (٤٠٥ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: تأريخ بغداد ٥/ ٤٧٣ و تذكرة الحفاظ ١٠٣٩/٣ و سير أعلام النبلاء ١٧/ ١٦٢.

تەدلیسکەر نەبوون، جگە لە موحەممەدی کوڕی سولەیمانی باغەندی[٧٤] واسیگی کە بۆ یەکەمجار تەدلیسی لەو شارەدا داهێنا[٧٥].

**جۆری دووەم: (تەدلیسی شیوخ):**

لەم جۆرە تەدلیسەدا تەدلیسکەر ناوی هیچ کەسێك لە سەنەدەکەدا ناسڕێتەوە، بەڵام دێت لە شێخێکەوە حەدیسەکە دەگێڕێتەوە، کە خۆی بە گوێی خۆی لێی بیستووەو ئەو شێخە لەناو هەموو خەڵکاندا ناوێکی ئاشکرای خۆی هەیە کە پێی دەناسرێت، بەڵام ئەو دێت بەو ناوە بەناوبانگەیەوە ناوی نابات، بەڵکو بە ناوێکی دیکەوە ناوی ئەهێنێ، کە خەڵکی بەو ناوەوە نەیانناسیووە و نازانن مەبەستی ئەوە.

وەکو ئەوەی کە نازناوێکی دەگمەنی دەخاتە پاڵ، یان ناوێکی تازە یان کونیەیەك وەکو (أبو فلان ـ ابن فلان) کە خەڵکان نایزانن، یان دەیداتە پاڵ هۆزێك، یان شارێك، یان پیشەیەك لە پیشەکان، وەکو موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی نەقاش یان دارتاش، یان زەڕەنگەر، یان ئاسنگەر، یان قەزاز یان بەزاز، کە خەڵکی هەرگیز ئەو کەسەیان بەم ناوانەوە نەناسیوە، کە ئەم لێی ناوە، هەر هەموو ئەمانەش لەبەرئەوە دەکات کە خەڵکی نەزانن ئەو کەسە کێیە، چونکە ئەگەر بزانن خێرا حەدیسەکە دەدەنەوە بەسەرو گوێلاکیا، کە زۆرجار ئەم کارە بۆیە دەکرێت لەبەرئەوەی کەسەکە لاواز و بێ متمانەیە و زانایان مەرجی گێڕەرەوەی حەدیسی تێدا نابینن[٧٦].

---

٧٤ لەساڵی (٢٨٣)ی کۆچی لە دنیا دەرچووە، بڕوانە ژیاننامەکەی لە: تذکرة الحفاظ ٢/ ٦٨٥ و سیر أعلام النبلاء ١٣/ ٣٨٦.

٧٥ (تدریب الراوي) ١٨٨.

٧٦ (التقیید والایضاح) ١/٤٥٠، (فتح المغیث للعراقي) ل٩٦. (الشذى الفیاح) ل٧٣.

**ئیمامی ئیبنو سەلاح خوای لێ رازی بێت دوو نموونەی بۆ ئەم جۆرە تەدلیسە بە دوو ڕیوایەت هێناوەتەوە لە ئەبی بەکری کوڕی موجاهیدی[٧٧] قورئان خوێنەوە، کە لە هەردووکیاندا تەدلیسی کردووە.**

**یەکەمیان لەئەبی بەکری عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی داودی سەجستانیەوە[٧٨] گێڕاوەتەوە، بەڵام بەم جۆرە ناوی بردووە: (بیستومە لە عەبدوڵڵای کوڕی باوکی عەبدوڵڵا) بڕوانن لەم فێڵ و فەتەکەیە، باشە جگە لە خوای گەورە کەسێکی تر هەیە بزانێت ئەم عەبدوڵڵایە کێیە؟ بۆچی لە جیهاندا یەك عەبدوڵڵا هەیە کە کوڕی باوکی عەبدوڵڵا نەبێت؟ دەزانن بۆچی نالێت عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی داود، چونکە ئەگەر وابڵێت هەموو زانایان دەزانن کێیە و حەدیسەکەی لێ وەرناگرن، چونکە بڕیاریان داوە کە حەدیس لەم عەبدوڵڵایە و هاوشێوەکانی نابێت وەربگیرێت، ئەوێك کە هەریەکە لە ئیمامەکانی دارەقوتنی[٧٩] و ئیبنوعودەی[٨٠] جورجانی و ئیبراهیمی ئەسفەهانی[٨١] بە لاوازی دەبینن و تەنانەت**

---

٧٧ ناوی ئەحمەدی کوڕی موسای کوڕی عەباسی کوڕی موجاهیدی نەحویە، لە ساڵی (٢٤٥ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٢٤ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تأريخ بغداد) ١٤٤، (سير أعلام النبلاء) ٢٧٢/١٥، (شذرات الذهب) ٣٠٢/٢.

٧٨ ناوی عەبدوڵڵای کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی سەجستانییە، زانایان بە لاوازی دەزانن، لە ساڵی (٣١٦) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (وفيات الأعيان) ٤٠٤/٢، (تذكرة الحفاظ) ٧٦٧/٢، (سير أعلام النبلاء) ٢٢١/١٣.

٧٩ زەهەبی دەفەرموێت: دارەقوتنی ناوی عەلی کوڕی ئەحمەدی بەغدادییە، یەکێکە لە پێشەواکانی حەدییس، لە ساڵی (٣٨٧ك) کۆچی دوایی کردووە و وێنەی خۆی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتووە، بڕوانە: (طبقات الحفاظ) ٣٩٣، (تذكرة الحفاظ) ١٣٢/٣، (سير أعلام النبلاء) ١٦/ ٤٤٩.

٨٠ ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عودەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد ئەبو ئەحمەدی جورجانییە، لە پێشەوا گەورەکانی زانیارییەکانی حەدیسە و خاوەنی پەرتووکی (الکامل)ە، لە ساڵی (٢٧٧ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٦٥ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: مێژووی جورجان ل٢٦٦، (معجم البلدان) ٧٨/٣، (سير أعلام النبلاء) ١٥٤/١٦.

٨١ ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەمزەی ئەسفەهانی. (سير أعلام النبلاء) ١٥٤/١٦.

بگێڕنەوە لە پێشەوایەکی وەکو ئـەبوداودی باوکییـەوە کـە فـەرموویێتی: کوڕەکـەم درۆزنـە هیچی لێوەرمەگرن، ئیتر چۆن ئەتوانێت بە ناوە ئاشکراکەی خۆی ناوی ببات؟[٨٢]

ریوایـەتی دووەمیـشیان لـە ئـەبی بـەکر موحەممـەدی کـوڕی حەسـەنی نەقاشـی[٨٣] گێڕاوەتەوە، کە بەم جۆرە ناوی هێناوە : (بیستوومە لە موحەممەدی کوڕی سەنەدەوە) کە لەمیشیاندا هەر فێڵی تێدا کرد، بەڵام بە جۆرێکی تر، دەبینیت موحەممەدی دایە پاڵ یەکێك لە باپیرە گەورە نەناسراوەکانی کە ناوی سەنەد بووە، کـە بـاپیری پێنجـەمی موحەممـەدە، چونکە خۆی ناوی موحەممەدی کـوڕی حەسـەنی کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی زیـادی کـوڕی هارونی کوڕی جەعفەری کوڕی سەنەدە، کە دیارە بۆیە ئاواشـی کـردووە، چـونکە دەیـەوێت گزی لەو خەڵکانە بکات و چەواشەیان بکات کەسەکە نەناسنەوە، چونکە لەوانەیە لـە هـەزارا یـەکێك نـەبوبێت لـەو نـاوەدا کـە نـاوی ئـەم بـاپیرە پێنجەمـەی ئـەمی زانیبێـت، گریمـان زانیبێتیشی، دەی چۆن بزانێت کە دەبێ ئەم موحەممەد و سەنەدە پێکەوە گـرێ بـدات کـە پێنج ناوی دیکە لێکی دوورخستونەتەوە، کەسێکی تریش تا ئێـستا ئـەم نـاوەی نـەهێناوە؟ کـە دیـارە بۆیـە نـاوە ئاشـکراکەی خـۆی بەکارنـەهێنا کـە (موحەممـەدی کـوڕی حەسـەنی نەقاشە)، چونکە ئەگەر بناسرێتەوە حەدیسەکەی تـووڕ دەدەن، لەبەرئـەوەی کەسـێکی بـێ متمانەیە و ناوی لە لیستی رەشی لاوازەکاندا تۆمار کراوە، کە هەر یەکێك لە عەبـدوڕەحیمی عێراقی و بەرقانی[٨٤] بە لاوازیان داناوە[٨٥]، بەڵام زەهەبی لە هەندێ زاناوە دەگێڕێتەوە کـە گەیاندوویانەتــە خــراپترینی پلــەی لاوازی و وتوویانــە: (نــەقاش لــە حەدیــسەکانیدا درۆ دەکات)[٨٦].

---

٨٢ (سیر أعلام النبلاء) ٣/ ٢٢٨، (میزان الاعتدال) ٢/٤٣٣.

٨٣ ئەم موحەممەدە لە ساڵی (٢٦٦ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٥١) کۆچی دوایی کردووە، زانایانی حەدیس بە لاوازیان داناوە، بڕوانە: (تأریخ بغداد) ٢/٢٠١.

٨٤ ناوی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی خوارەزمییە. (سیر أعلام النبلاء) ١٧/ ٤٦٤.

٨٥ التقیید والایضاح ٢/١٠٠١.

٨٦ تذکرة الحفاظ ٣/٦٠٨ و (سیر أعلام النبلاء) ٥/٥٧٥، (لسان المیزان) ٥/١٣٢.

بەلای زانای خوا لیٚ خۆش بوو (د. سوبحی سالٚح) وە ناوبردنی شیٚخ بەو وشانەش کە دەبن بە هۆی گەیاندنی پلەوپایەیەکی زانستی وەها کە ئەو کەسە لە ئاستییدا نەبیٚت، هەر بە تەدلیس دادەنریٚت، کە لە باسی تەدلیسی شیوخدا دەفەرمویٚت: "ئەم جۆرە وەکو ئەوەی کە شیٚخەکەی وەسفدار بکات بەو وەسفانەی کە گەورەتر بن لە توانا و دەسەلاٚتی ئەو، بۆ ئەوەی بەرچاوی خەلٚکی لیٚلٚ بکات و نەیناسنەوە، وەکو ئەوەی کە بلٚیٚت: (حدثنا العلامة الثبت) یان (الحافظ الضابط)"[٨٧].

دەربارەی ئەم فەرموودەیەی دکتۆریش لەوانەیە بۆچوونەکە راست بیٚت و کارەکە بە تەدلیس دابنریٚت، ئەگەر گیٚڕەرەوەکە بۆ ناوبردنی شیٚخەکەی بەس ئەم جۆرە نازناوانەی بەکارهیٚنا، بەبیٚ ناوەڕاستییە تایبەتییەکەی خۆی، چونکە ئەم نازناوانە گشتیین و دەتوانریٚت بنریٚت لە کەسانی زۆر، لەبەرئەوە کە بە تەنهایی خۆیان بەکاردەهیٚنریٚن، نازانریٚت کیٚی مەبەستە پیٚیان، بەلاٚم ئەگەر ناوی راستیی کەسەکە شان بە شان لە تەکیاندا وترا، لام وابیٚت کە کیٚشەی تیٚدا نییە، بۆ نموونە وەکو ئەوەی کە بلٚیٚت: (حدَّثنا العلامة الثبت سفيان الثوري) تەنها ئەوەی تیٚدایە کە لە تویٚژینەوەی ئەکادیمیی ئەمڕۆی خۆماندا بەکارهیٚنانی ئەم جۆرە نازناوانە بە جوان دانانریٚت، بەتایبەتی بۆ کەسانی زیندوو.

یەکیٚك لەو زانا گەورانەی کە گلەیی تەدلیس کردنیان لیٚ دەکریٚت، خەتیبی بەغدادییە[٨٨]، ئیمامی ئیبنو سەلاٚح دەفەرمویٚت: خەتیب لە دانراوەکانیدا بەزۆری تەدلیسی شیوخ دەکات، هەروەها حافیزی عیٚراقیش هەمان قسە دووپات دەکاتەوە، نموونەیەکی زۆریان لەو تەدلیسانەی هیٚناوەتەوە، وەکو ئەوەی کە خەتیب لە دانراوەکانیدا ریوایەت لەم سیٚ ناوەوە دەکات: (ئەبی لقاسم ئەلئەزهەری) و (عوبەیدوللاٚی کوڕی ئەحمەدی کوڕی

---

[٨٧] علوم الحديث ومصطلحه ل١٧٢.

[٨٨] پیٚشەوا و حافیز و میٚژوونووسی گەورە، ئەبوبەکری ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی سابتی بەغدادییە، لە سالٚی (٣٩٢ك) لە دایك بووە و لە سالٚی (٤٦٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: وفيات الأعيان ٩٢/١، (البداية والنهاية) ١٠١/١٢.

عوسمانی سەیرەفی) و (عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبی فەتحی ماسی)، کە هەرسێکیشیان بریتین لە یەك کەس[89].

هەروەها خەتیب ریوایەت لەم چوار کەسەی خوارەوەش دەکات:

(ئەبی لقاسم عەلی ئەتتەنوخی) و (عەلی کوڕی ئەبی عەلی ئەلموعەدەل) و (عەلی کوڕی ئەلموحسین) و (ئەبی لقاسم عەلی کوڕی ئەلموحسین ئەتتەنوخی) کە هەر چوار ناوەکەش بریتین لە یەك کەس[90].

گەلی نموونەی تریش لەم بابەتانە، کە لە کاتێکدا باسی کەسێك دەکات، هەر جارەی بەناوێك لەم ناوانە ناوی دەبات، کە لەوانەیە زۆربەی خەڵکان سەریان لێ چەواشە ببێت و بە ئاسانی لە مەبەستی تێ نەگەن[91].

بەم جۆرە ئیبنو سەلاح و عێراقی و چەند کەسانێکی دیکە گلەیی خۆیانیان لە خەتیب کرد، بەڵام شێخی گەورە ئیبنو حەجەری عەسقەلانی هەر وەکو عادەتی خۆی کە هەمیشە و هەر کاتێك عەیبێکی خەڵکی بۆ باس بکەن، خێرا بە ڕەوشتە جوانەکانی خۆی هەوڵی داپۆشین و پینەکردنێکی جوانی بۆ دەدات، هەر دەڵێی شاعیری گەورە، شەوقی، ئیلهامی ئەم بەیتە جوانەی لە ڕەوشتە جوانەکەی ئەوەوە بۆ هاتووە کە دەفەرموێت:

رُزقت أروع ما في الناس من خُلق — إذا رُزقتُ إلتماس العذر في الشيم

لێرەشدا عەسقەلانی دەبێتە پارێزەرێکی دڵسۆز و دەربارەی ئەم دیاردەیەی لای خەتیب دەفەرموێت:

"چاك وایە کە خەتیب لەم بوارەدا بکرێت بە پێشەوا و کردارەکەی بکرێت بە بەڵگە لەسەر دروستی ئەم کارە، چونکە ئەو مەبەستی چەواشە کردنی خەڵکی نییە، ئەوانەی کە لە قسەکانیشی تێ ناگەن تەنها ئەوانەن کە پەیوەندییان بەو جۆرە باسانەوە نییە کە ئەو ئەیان کات. بەڵام پەیوەندیدارەکان لەبەرئەوەی شارەزای ژیاننامەی گێڕەرەوانی حەدیسن،

[89] بڕوانە ژیاننامەکەی لە (سیر أعلام النبلاء) ١٥٤/١٦. دا ب١٧، ل٥٧٨.

[90] بڕوانە ژیاننامەکەی لە (سیر أعلام النبلاء) ٦٤٩/١٧.

[91] علوم الحديث ومصطلحه، ل١٧٢، بەوەرگرتن لە (توضيح الافكار) ٢٦٩/١.

بەهیچ جۆرێك سەریان لێناشێوێت، کەسیش نەڵێت کە خەتیب بۆیە ئەمەی کردووە، کە خەڵکان تێ بگەیەنێت کە گوایا مامۆستای زۆرە، چونکە ئەو ئەوەندەی مامۆستا و شێخ هەبووە کە لە باسکردن نایەن، هەموو زانایانی دوای خۆیشی پێویستیان بە زانیاری و دانراوەکانی ئەوە و لە دەریای زانستی ئەو هەڵ ئەهێنجێنن"[٩٢].

شایانی باسە کە هەر بە جۆری تەدلیسی شیوخ دادەنرێت ئەگەر ئەو کەسە شێخەکەی دایە پاڵ وڵاتێك لە وڵاتەکان، یان هەر شوێنێك لە شوێنەکان، بۆ ئەوەی شێخەکەی گەورە بکات، یان خەڵکان نەیناسنەوە کە کێیە، یان وا ڕاگەیەنێ کە بەڕێزی ئەو شوێنەی بینیوە، ئەمەش وەکو ئەو نموونەیەی کە باسکرا لە پێشەکییەکەدا دەربارەی ناوی (ما وراء النهر) بۆ بەشێك لە دوو بەرەکەی شاری بەغدا، یان قاهیرە، یان هەر شارێکی دیکە کە رووبارێکی گەورەی وەکو دیجلە و نیل کەرتی بکات.

هەروەها وەکو ئەوەش کە کەسێك بڵێت (فلان کەس بۆی گێڕامەوە لە ئەندەلوس یان لە قاهیرە یان لە فەلەستین و مەبەستی گۆڕەپانی ئەندەلوس بێت، یان گەڕەکی قاهیرە بێت، یان شەقامی فەلەستین بێت لە بەغدا، یان دەیان ناوی تریش کە خۆی لە راستییدا ناوی شوێنێکە و پاشان بۆ رێزلێنانی ئەو شوێنە، کراوە بە ناو بۆ جێگایەکی تر، کە دیارە لەبەکارهێنانی ناوەکەدا خەڵکی بیریان بۆ لای خاوەنی یەکەم جاری ناوەکە دەڕوات.

**جۆری سێهەم: (تەدلیسی تەسویە):**

حافیزی عێراقی، ئەم جۆرەی بە خراپترینی هەموو جۆرەکانی تەدلیس داناوەو دەفەرموێت: شێوازی ئەم تەدلیسە ئەوەیە کە تەدلیسکەر حەدیسێکی لە کەسێکی متمانە پێکراو بیستووە و ئەو شێخەش حەدیسەکەی لە کەسێکی لاواز بیستووەو ئەو لاوازەش لە کەسێکی متمانە پێ کراوی بیستووە، ئینجا لێرەدا تەدلیسکەر دێنێت ئەو کەسە لاوازەی کە شێخی شێخەکەیەتی لە زنجیرەی سەنەدەکەدا لایدەبات و راستەوخۆ شێخی دوای ئەو کە خاوەنی متمانەیە دەخاتە دوای شێخە متمانەدارەکەی خۆیەوە، بەو شێوازەی کە پێی

---

٩٢ بەوەرگرتن بە هەندێ دەستکارییەوە لە پێشەکی (تأريخ بغداد) بڕوانە ب١، ل١٤.

**دەڵێن عەنعەنە، واتە (عن فلان عن فلان... هتد)، لێرەدا ترسناکترین تەدلیس روودەدات لە دوو لایەنەوە:**

**لایەنی یەکەم ئەوەیە کە زنجیرەکە پاککرایەوە و لاوازیی تێدا نەهێڵراو هەموو کران بە کەسانی بەهێز و متمانەدار.**

**لایەنی دووەمیش ئەوەیە کە لەبەرئەوەی کەسە لاوازەکە، نەکەوتووەتە دوای تەدلیسکەرەوە، بەڵکو ئەوەی دواوە شێخێکی متمانەدارە و لە زنجیرەکەدا ماوەتەوە و خۆی حەدیسەکەی لە دەمی بیستووە، دێت وشەی (سمعتُ) یان (حدَّثني) یان وێنەی ئەمانە بەکاردەهێنێت، کە ئەمانە بە دڵنیاییەوە بە یەکگەیشتن و لێ بیستن دەگەیەنن بە هیچ شێوەیەك بواری ئەوە نامێنێت بۆ زۆربەی خەڵکی[٩٣] کە هەست بە تەدلیس بکەن لە حەدیسەکەدا، چونکە وەکو زانرا لە تەدلیسی ئیسناددا، تەدلیسکەر بۆی نییە وشەی وەکو (سمعتُ - حدَّثني) بەکاربهێنێت، بەڵام لێرەدا تەدلیسیشی کرد و ئەم وشانەشی بەکارهێنا[٩٤].**

**وادیارە بەم جۆرە تەدلیسەش دەوترێت: (تدلیس التسویة) چونکە ئەوەی خراپە لە زنجیرەکەدا لابراوە، هەروەکو شەقامێك لە بەرزی و نزمی و کوچك و کلۆکەی تەخت و یەکسان دەکرێت، ئەمیش تەخت بووە و گرێ و گۆڵی تێدا نەماوە، واش زانراوە کە یەکەمین کەسێ کە ئەم ناوەی لێ ناوە ئەبولحەسەنی کوڕی قەتتان بووە[٩٥].**

**بەڵام زانایانی پێش ئەم پێیان وتووە: (تدلیس التجوید)، چونکە تەدلیسکەر هەرچی خراپە لای دەبات و بەس کەسە باشەکان دەهێڵێتەوە[٩٦].**

---

[٩٣] لەبەرئەوەش وتم: زۆربەی خەڵکی هەست بەم جۆرە تەدلیسە ناکەن، چونکە ئیمامە گەورەکانی حەدیس ئەوەندە شارەزان و ئاگاداری مێژووی کەسانی ئەم بوارەن، باوەڕ ناکرێت هیچ هەڵە و درۆ و گزییەکیان لەدەست دەرچێت و هەستی پێ نەکەن، وەکو ئەم نموونەیەی کە پاش تۆزێك لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە دەیخوێنیتەوە.

[٩٤] التقیید والایضاح ٤٤٦/١، وە (الشذی الفیاح) ل٩٨.

[٩٥] (تدریب الراوي)، ل١٨٣.

[٩٦] التقیید والایضاح، ٤٤٦/١ـ ٤٤٧.

ئەوی راستی بێت زانا و پێشەوایانی حەدیس، ئەم جۆرەی تەدلیس بە خراپترین و ترسناکترینی تەدلیس دادەنێن، چونکە کەسی متمانەداری یەکەم ـ کە کەسە لاوازەکە لە دوایەوە لابراوە ـ لەوانەیە هەرگیز تەدلیسی نەکردبێت و نەشی کات، لەبەرئەوە خەڵکان بەچیدا بزانن کە کەسێکی لاوازی لە دواوەوە بووە و نەگبەتەکەی پێشووە، ئەو کەسەی دوای ئەمی زیندەبەچاڵ کردووە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە هەروەکو لەمەوپێش وتمان ئەوانەی ئێستاش لە دوایەوە ماون، هەموویان خاوەنی متمانەن، کەواتە زنجیرەکە سەرانسەر بە کەسانی متمانەدار دێتە پێش چاو، لەبەرئەوە بڕیاری سەحیحی بۆ حەدیسەکە دەردەکەن کە لە راستیشدا حەدیسێکی لاوازە[٩٧].

زانایانی حەدیس چەن کەسێکیان دەستنیشان کردووە، کە ئەم جۆرە تەدلیسەیان دەکرد، لەوانەیە لەپێش هەموانەوە بەقییەی کوڕی وەلید[٩٨] و وەلیدی کوڕی موسلیم[٩٩]، کە دەبینین حافیزی عێراقی چەند جارێك بۆ نموونەی تەدلیسی تەسویە، ئەمانی هێناوەتەوە و لە زانای گەورەی جەرح و تەعدیلەوە، عەبدوڕەحمانی[١٠٠] کوڕی ئەبی حاتەمی رازییەوە دەگێڕێتەوە کە لە پەرتووکی (العلل)دا فەرموویەتی: جارێکیان لە خزمەتی باوکمدا ئەو حەدیسە خوێنرایەوە، لە ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیە[١٠١] لە بەقییەوە دەیگێڕێتەوە کە

---

[٩٧] (فتح المغيث للعراقي)، ل٩٨، وە (فتح الباقي) ١٧٠.

[٩٨] بەقییەی کوڕی وەلیدی کوڕی سائیدی کیلاعی لە ساڵی (١١٠ك) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٣٣١/١، وە (سير أعلام النبلاء) ٥١٨/٨، وە (تهذيب التهذيب) ٤٤٥/١ (٨٨٠).

[٩٩] وەلیدی کوڕی موسلیمی شامی لە ساڵی (١١٩ك) لە دایك بوەو لە ساڵی (١٩٥ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (لسان الميزان) ٤٢٧/٧، وە (تقريب التهذيب) ٣٣٦/٢.

[١٠٠] عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی حاتەمی حافیزی رازی، خۆی و باوکی دوو پێشەوای گەورەی زانستی حەدیسن لە (٢٤٠ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٣٢٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٧/١، (سير أعلام النبلاء) ١٥٣/١٦.

[١٠١] ئیسحاقی کوڕی راهەوەیە ئەبویەعقوب، پێشەوایەکی گەورەیە و زەهەبی بە (سيد الحفاظ) ناوی هێناوە، بڕوانە: (سير أعلام النبلاء) ١١/ ٣٥٨.

بەقیە دەڵێت: بیستم لە ئەبی وەهەبی ئەسەدییەوە، لە نافیعەوە[١٠٢] لە ئیبنو عومەرەوە[١٠٣] حەدیسی (لا تحمدوا اسلام المرء حتى تعرفوا عقدة رأيه)[١٠٤]. باوکم فەرمووی: ئەم حەدیسە گرێیەکی تێدایە بەدەگمەن کەسێك بێت هەستی پێ بکات، زنجیرەی راستی سەنەدەکە وەهایە:

لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەمرەوە[١٠٥]، لە ئیسحاقی کوڕی ئەبی فەروەوە[١٠٦] لە نافیعەوە، لە ئیبنوعومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کەچی دەبینیت بەقیە دوو گۆڕانکاری نابەجێی تێدا کردووە، یەکەمیان (عوبەیدوڵڵای کوڕی عەمرە) کە بەم ناوە ناسراوە لە زنجیرەکانی حەدیسدا، هاتووە بە ناوی کوڕەکەیەوە کە (وهب)ەو عەشیرەتەکەیەوە کە (ئەسەد)ە ناوی هێناوەو وتوویەتی (أبو وهب الأسدي) تاوەکو کەس نەزانێت مەبەستی (عوبەیدوڵڵای کوڕی عەمرە)، ئەمەشی بۆیە کردووە، تاوەکو گۆڕانکاری دووەمی بۆ بچێتە سەر کە لابردنی (ئیسحاقی کوڕی ئەبی فەروەیە) لە زنجیرەکە.

وابزانم کە ئاشکراش بێت، کە بەقییە بۆچی هەستاوە بەم کارە، لە کاتێکدا کە باش دەزانێت ئەو کەسانەی کاری ئاوا ئەنجام دەدەن متمانەش لەدەس دەدەن، گومانی تێدا نییە ئەگەر ئیسحاقی لابراو کەسێکی بەهێز بوایە هەرگیز لای نەدەبرد، ناوی خۆشی بە لابردنەکەی ئاوەها نەدەزڕان، دیارە بۆیە لای بردووە، چونکە کەسێکی بێ متمانەیە و نەمانی ئەو لە زنجیرەی سەنەدەکەدا هێز و پێزێك لە رێگای تەزویرکردنەوە دەدات بە

---

١٠٢ نافیع ئەبو عەبدوڵڵا مەدەنی، ئازادکراوی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، بوخاری زنجیرەی (مالیك + نافیع + ابن عمر) بە زنجیرەی ئاڵتون دادەنێت، لە ساڵی (١٢٠ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٢٩٨/٢٩، (الكاشف) ١٩٧/٣، (البداية والنهاية) ٣١٩/٩.

١٠٣ عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب، یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکانی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێت) لە ساڵی (٧٣ك) لە تەمەنی (٨٦) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الاستیعاب) ل٤٧٣ (١٦٣٤).

١٠٤

١٠٥ عوبەیدوڵڵای کوڕی عەمر کوڕی ئەبو وەلید ئەبو وەهەبی ئەسەدی، کەسێکی متمانەدارە لە ساڵی (١٨٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ٤/ ٣٤٠ (٥٠٧٩)، (سير أعلام النبلاء) ٣١٠/٨.

١٠٦ ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی فەروە، کەسێکی لاواز و بێ متمانەیە، بڕوانە: (المجروحين) ١١٩/١.

حەدیسەکە، بە خەیاڵی خۆی - قەت باوەڕیش ناکەم - لە خاڵی پشکنینی زانایان دەیپەڕێنێتەوە.

لاوازی ئیسحاقیش بە شایەتیی زانایان سەلمێنراوە، ئیمامی ئیبنو حیبانی بوستی دەربارەی دەڵێ: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی فەروە، کە ناوی ئەبی فەروەش (کەیسانە) کەسێکی لاوازە، هەندێ جار سەنەدەکانی هەڵ دەگێڕایەوە - واتە شوێن گۆڕکێی بە کەسەکان دەکرد - وە هەندێ جاریش حەدیسی مورسەلی بەرز دەکردەوە - واتە ئەو حەدیسانەی کە لە تابیعییەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت) دەگێڕایەوە و ناوی سەحابییەکەی تێدا نەبوو، ئەم لەخۆیەوە پەلی سەحابییەکەی دەگرت و لەو نێوانەدا دایدەنا - هەروەها ئیمامی ئەحمەدیش فەرمانی دەدا بە خەڵکی کە هەرگیز توخنی حەدیسەکانی ئیسحاق نەکەون[١٠٧].

* * *

دەربارەی وەلیدی کوڕی موسلیمیش زانایان دانیان ناوە بەوەدا کە لە حەدیسەکانیدا تەدلیس دەکات، وەکو ئیمامی دارەقووتنی روونی کردووەتەوە[١٠٨].

هەندێکی تر لە شارەزایانی حەدیس فەرموویانە: وەلیدی کوڕی موسلیم ئەو حەدیسانەی کە ئەوزاعی[١٠٩] لە درۆزنەکانەوە دەی گێڕایەوە، ئەم ئەهات لە ئەوزاعییەوە دەیگێڕایەوە و تەدلیسی تیادەکرد و درۆزنەکانی دوای ئەوزاعیی لادەبرد[١١٠].

---

١٠٧ (المجروحين) ١/١١٩.

١٠٨ (الضعفاء والمتروكين) دانراوی دارەقوتنی، ل٤١٥.

١٠٩ ناوی ئەبو عەمر عەبدوڕەحمانی کوڕی عەمری ئەوزاعی دیمەشقییە، بە شێخی ئیسلام و پێشەوای موسڵمانان ناوبراوە، لەساڵی (٨٨ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٥٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ١/١٧١، (تذكرة الحفاظ) ١/ ١٣٤، (تقريب التهذيب) ١/٤٩٣.

١١٠ (تهذيب التهذيب) ٦/٧٠٥.

**ئیمامی جەزرە[111] دەفەرموێت: بیستم لە هەیسەمی کوڕی خاریجە[112] کە فەرمووی جارێکیان بە وەلیدم وت: لەراستییدا هەموو حەدیسەکانی ئەوزاعیت ناشیرین و شێواو کردووە!! وتی: چۆن؟ وتم: تۆ دێیت حەدیس دەگێڕیتەوە لە ئەوزاعییەوە، لە نافیعەوە، وە دەگێڕیتەوە لە ئەوزاعییەوە لە زوهرییەوە، وە دەگێڕیتەوە لە ئەوزاعییەوە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە[113]، کەچی کەسەکانی غەیری تۆ کە ئەم حەدیسانەی تۆ دەگێڕنەوە لە نێوان ئەوزاعی و ئەو کەسەی دواوەیدا کەسێکی تر ناودەبەن، کە تۆ ئەو کەسەت لابردووە، بەم جۆرە لە نێوان ئەوزاعی و نافیعدا عەبدوڵڵای کوڕی عامری ئەسلەمی[114] ناو دەبەن، لە نێوان ئەوزاعی و زوهریدا هەریەکە لە ئیبراهیمی کوڕی مورە[115] و (قەرە)[116] زیاد دەکەن، کەچی وتی: ئەوزاعی زۆر لەوە گەورەترە کە ریوایەت لەم جۆرە کەسانەوە بکات، وتم باشە ئەگەر ئەوزاعی ریوایەتی لەم جۆرە کەسە لاوازانەوە کرد و چەند حەدیسێکی سەیر و سەمەرەی لێوە گێڕاناوە، پاشان تۆ ئەو کەسە لاوازانەت لابرد و تەنها متمانەدارەکانت هێشتەوە، ئەوە مەعنای وایە کە تۆ تاوانێکی گەورەت بەرامبەر ئەوزاعی ئەنجام داوە و بووی بە هۆی لاوازکردنی و لەدەستدانی متمانەی لەناو خەڵکیدا، کەچی گوێی نەدایە قسەکانی[117].**

---

[111] ناوی ئەبو عەلی ساڵحی کوڕی موحەممەدی بەغدادی، پێشەوا و متمانەدار بووە، لە ساڵی (٢٠٥ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٢٩٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تأريخ بغداد) ٣٢٢/٩، (البداية والنهاية) ١٠٣/١١، (تذكرة الحفاظ) ١٥٩/٢.

[112] هەیسەمی کوڕی خاریجە، ئەبو ئەحمەدی مەڕۆزی، بە شوعبەی بچووك ناونراوە، لە ساڵی (٢٢٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ٦٩١/٦.

[113] بڕوانە ژیاننامەکەی لە: سير أعلام النبلاء ٥/ ٤٦٨.

[114] ئەحمەد و ئەبو زورعە و نەسائی و ئەبوداود و ئیبنو حیبان، ئەسلەمی بە لاواز دەزانن، لە ساڵی (١٥٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (المجروحين) ١٤/٢، (تهذيب التهذيب) ٥٣٠/٣.

[115] ئیبراهیمی کوڕی مورە یەکێکە لە لاوازەکان، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٤٤١/٢.

[116] قەرەی کوڕی عەبدوڕەحمان متمانەی پێ ناکرێت، لە ساڵی (١٤٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (المجروحين) ٢١٩/٢، (لسان الميزان) ٣٢٤/٧.

[117] (التقييد والايضاح) ٤٤٨/١، (فتح المغيث للعراقي) ل٩٩، (جامع التحصيل) ل١١٨.

**ئینجا لەوانەیە کە تەدلیسی تەسویە تایبەت نەبێت بە لابردنی شێخێکی لاواز بە مەبەستی ئەوەی زنجیرەی سەنەدەکە بەهێز بکرێت و خەڵکی بە لاوازی دانەنێن و حەدیسەکەی وەرنەگرن، بەڵکو لەوانەیە کە تەدلیسکەر کەسێکی متمانەداریش لا ببات، بۆ ئەوەی خەڵکان وابزانن کە ئیسنادی حەدیسەکە عالییە**[١١٨]**.**

**نموونەی ئەمەش وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیبنو عەلبدولبەڕ بە سەنەدی خۆی دەیگێڕێتەوە لە هوشەیمی کوڕی بەشیرەوە**[١١٩]** لە یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنسارییەوە، لە**

---

[١١٨] ئیسنادی عالی هەوڵدانە بۆ نزیك کەوتنەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) یان لە یەکێك لە پێشەواکانی حەدیسەوە، چونکە مەبەست لە ئیسنادی عالی ئەو حەدیسەیە کە ژمارەی کەسەکانی ناو زنجیرەی سەنەدەکەی لەگەڵ ئەوەشدا کە لە یەکترییان وەرگرتووە، کەمترە لە ژمارەی سەنەدێکی تر کە هەر هەمەمان حەدیسی پێ ریوایەت کراوە، بەڵام بە ژمارەیەکی زیاتر لە کەسانی سەنەدەکەی یەکەم.

کەواتە ئەگەر حەدیسێك بە دوو سەنەدی جیاواز بگێڕرێتەوە و کەسانی ناو هەردوو سەنەدەکەش لە یەکترییان بیستووە، بەڵام یەکێکیان شەش کەسە و ئەویتریان حەوتە، ئەوا سەنەدی شەش کەسەکە بە (عالی) دادەنرێت و حەوت کەسەکەش بە (نازل)، تا ژمارەکە کەمتر بێت (عالی) بوونی سەنەدەکە بەهێزتر و بەنرختر دەکات.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە پێشەواکانی حەدیس هەمیشە شەیدای سەنەدی عالی بوون، لە پێناویدا وڵاتە و وڵات گەڕاون، چونکە تاوەکو ژمارەی کەسەکان لە سەنەددا کەمتر بێت ئەوا ئەگەری راستیی حەدیسەکە زیاتر دەبێت، لەبەرئەوەی کە هەریەکێك لە کەسەکانی لەوانەیە ببێت بە هۆی دروست بوونی هەڵەیەك لە حەدیسەکەدا، جا بەدەستی ئەنقەست بێت، یان لەبەر هەڵەکردن، کەواتە تا ژمارەی کەسەکان کەمتر بێت ئەگەری هەڵە و کەموکوڕی کەمترە.

ئیسنادی عالیش لەسەر پێنج جۆر دێت، لە هەموویان چاکتر ئەوەیانە کە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) نزیك بێت.

دەگێڕنەوە کە لە کاتی سەرەمەرگیدا لە یەحیای کوڕی موعین-یان پرسی: حەز لە چی دەکەی؟ ئەویش فەرمووی: (ماڵێکی خاڵی و ئیسنادێکی عالی)، بەندە، نووسەری ئەم دێڕانە توێژینەوەیەکی لە ئیسنادی عالی و نازل دا بە زمانی عەرەبی نووسیوە. بڕوانە: (التقیید والایضاح) ٧٥٢/١، (علوم الحدیث) ٢٣٦، (موسوعة علوم الحدیث) ٢٥٣/١.

[١١٩] هوشەیمی کوڕی بەشیری کوڕی ئەبی حازم، قاسیمی کوڕی دینار، (سیر أعلام النبلاء) ١٣/٦.

زوهرییەوە، لە هەردوو براوە عەبدوڵڵا و حەسەنی[١٢٠] کوڕانی موحەممەدی کوڕی عەلی و حەنیفە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) (نیکاحی موتعە[١٢١] و گۆشتی کەری ماڵی) قەدەغە کردووە[١٢٢].

پاشان ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێت: زانایان ڕایان وایە کە لە زنجیرەکەدا، قرتاوی هەیە، یەحیای کوڕی سەعید، ڕاستەوخۆ لە زوهری نەبیستووە، بەڵکو یەحیا لە مالیکی بیستووە و ئەویش لە زوهری.

پاشان ئیبنو عەبدولبەڕ هەر بە سەنەدی خۆی هەمان حەدیسی لە عەبدولوەهابی سەقەفییەوە[١٢٣] و حەمادی کوڕی زەیدەوە[١٢٤]، گێڕاوەتەوە، کە هەردووکیان ئیمامی

---

١٢٠ عەبدوڵڵا و حەسەن هەردووکیان کوڕی موحەممەد حەنیفەی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن (خوایان لێ ڕازی بێت)، بۆ ژیاننامەی عەبدوڵلا بڕوانە: (تهذيب الكمال) ١٦/٨٥، (الكاشف) ٢/١٢٧ کە تیایدا نووسراوە کە ئەبو هاشم عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد حەنیفە لە ساڵی (٩٩ك) کۆچی دوایی کردووە، بۆ ژیانی حەسەن بڕوانە: (سير أعلام النبلاء) ٤/١٣٠، (تهذيب التهذيب) ٢/ ٧٠ (١٥١٩).

١٢١ نیکاحی موتعە بەوە دەوترێت کە کەسێك ئافرەتێك مارە بکات بۆ ماوەیەك، جا کەیفی خۆیەتی ماوەکە دیاری کراو بێت، وەکو شەوێك حەفتەیەك مانگێك، یان دیاری نەکراو بێت، وەکو ئەوەی کە بڵێت ئەوا من کچەکەی خۆمم لێ مارە کردن تا فلان کەس لە سەفەرەکەی دەگەڕێتەوە.

زانایانی فیقهی ئیسلامیی زۆر بە وردی لەم نیکاحە کۆڵاونەتەوە و لەوە دواون کە بۆچی لە سەرەتاوە ڕێگای پێ دراوە، پاشان حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێت) حەرامی کردووە، دوای لێکۆڵینەوەیەکی قووڵیان لە باسەکەدا هەر چوار ئیمامە سوننییەکان (ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەد) (خوایان لێ ڕازی بێت) بە کۆی دەنگ بڕیاری حەرامی و قەدەغەکردنیان داوە، بۆ درێژەی باسەکە بڕوانە: (المجموع شرح المهذب)، ب١٩، ل٣٥٩- ٣٦٠.

١٢٢ حەدیسێکی سەحیحە، بڕوانە بوخاری حەدیسی (٤٢١٦)، موسلیم حەدیسی (٢٩ـ ٣٢ـ ١٤٧)، تیرمزی حەدیسی (١١٢١)، ئیبنو ماجە حەدیسی (١٩٦١) مالیك بڕوانە: (التمهيد) ب٤، ل٣٠٤.

١٢٣ ئەبو موحەممەد عەبدولوەهابی کوڕی عەبدولمەجیدی سەقەفی یەکێکە لە پێشەواکانی حەدیس، لە ساڵی (١٩٤ك) لە تەمەنی (٨٤) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٦/٣٦١، (ميزان الاعتدال) ٢/٦٨٠، (لسان الميزان) ٤/٨٨.

١٢٤ ستایشێکی زۆر لەسەر (حەماد) نووسراوە لە ساڵی (١٧٩ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تذكرة لحفاظ) ١/١٦٧، (سير أعلام النبلاو) ٧/٤٥٦.

مالیکیان لە نێوان یەحیا و زوهریدا باس کردووە، پاشان دەفەرموێت بە پشتیوانی خوای گەورە ئەمانە راستن نەك ریوایەتەکەی هوشەیم[125].

شایانی باسیشە کە دەڵێین: یەحیا لە زوهری نەبیستووە، مەبەستمان ئەم حەدیسەی ئێرەیە، ئەگینا یەحیا بە خزمەتی زوهری گەیشتووە و چەندین حەدیسی تری جگە لەمەی، لێ وەرگرتووە.

هەروەها ئەوەش لە یاد نەکەین کە کاتێك هوشەیم تەدلیسی تەسویەی لەم حەدیسەدا کرد، لەبەر لاوازیی کەسەکە نەبوو تاوەکو لە رێگای لابردنیەوە حەدیسەکەی بایەخدار کات، چونکە ئەو کەسە ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەسە و یەکێکە لە شۆڕەسوارانی مەیدانی حەدیس و زانیارییەکانی[126].

جا لێرەدا ئیبنو عەبدولبەر دەفەرموێت: ئیمامی مالیك فەرموویەتی: کاتێك کە یەحیای کوڕی سەعید کرا بە قازی لە عێراق و چوو بۆ وەرگرتنی پۆستەکەی، داخوازیی لێ کردم کە ئەو حەدیسانەی لە ئیمامی زوهریم بیستووە دەربارەی (أقضية) بۆیانی بنووسمەوە، منیش داواکەیم جێبەجێ کرد، جا واگومان دەبەم کە ئەم حەدیسە یەکێك بێت لەو کۆمەڵە حەدیسانە[127].

---

[125] (التمهيد) ٤/٣٠٤.

[126] (النكت) ٢/٦٢١.

[127] (التمهيد) ٤/٣٠٥، ٥/١٠.

باوەڕ ناكرێت كەسێك هەبێت لـە راسـتیخوازاندا خاوەنـانی ویـژدان و زانیبێتـی كـە تـەدلیس مانای چییە و بۆچی دەكرێت، ئەم كارە بەباش بزانێـت و حـەزی لـێ بكـات، تەدلیـسێك كـە بریتی بێت لە گزی و دزی كردن لە فەرموودەكانی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێـت) و چەواشەكاری و رووكـەش كـردن و داپۆشـینی عـەیبی عەیبـدار و فرۆشـتنی زەرد بـە نرخـی ئـاڵتون، ئـەوا بێگومـان هـەموو ویژدانـدارێك و چـاكەكارێك بێـزی لێدەكاتـەوە و خـۆی لـێ دووردەخاتەوە.

ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام ئـاڵای (مَـنْ غَـشنا فَلَـیس منـا)ی بـە ژووری سـەدی هـەموو هەڵسوكەوتێك و كاروبارێك و ئاڵوگۆڕێكدا هەڵكردووە، هـان دەدات كـە هـەموو شـتێك وەكـو خۆی پیشان بدرێت و هەرگیز رێگای غەش و چەواشـەكاری و گـزی و فـێڵ كردنـی نـەداوە، بەڵكو رێگاشی داوە كە لە كاتی پێویستیدا تەنانەت باسی عەیب و عاری خـەڵكانیش بكـەین و بیخەینە بەرچاو، بۆ ئەوەی ئەو كەسەی بە تـەمای تێكـەڵ بوونیانـە بەهـەر هۆیـەك بێـت، تووشی كێشە نەبێت لەگەڵیاندا.

جا لە كاتێكدا ئەمانە پێویست بێت ئـەی چـۆن دەبێـت عـەیب و عـاری ئـەو فەرموودانـە داپۆشرێت كە دەدرێنە پاڵ پێغەمبەری نـازدار (دروودی خـوای لەسـەربێت) لـە كاتێكـدا كـە فەرموودەكانی هەر هەمووی ئیلهامی خواین و سەرچاوەی دووەمی و شەریعەتن و حەڵاڵ و حەرامیان پێ دەسەلمێنرێت؟ كێ دەڵێت ئەو دەقەی كە بە حەدیس دراوەتە قەڵەم، بـەدەم پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) هەڵنەبەستراوە؟ كە ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی كـە دەبێت بە درۆ بە دەمی خوا و پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبێت بـەهۆی لـە خـشتەبردنی موسـڵمانان و سەرلێـشێوانیان و هەنـدێ جـار رەخـساندنی ئـاگری دۆزەخـیش بۆیان.

وەكـو زانیمـان تـەدلیس سـێ جـۆری هـەبوو، بێگومانیـشین كـە هەرسـێ جۆرەكـەی تیروتـوانجی زانایـانی تـێ گـیراوە، بـەڵام لەوانەیـە ئـەو تیرانـەی كـە گیراوەتـە جۆرێكیـان نووكەكانیان تیژتر و زەهراوی تر بێت لە تیرەكانی جۆرێكی تر.

دەربـارەی حـوكمی جـۆری یەكـەم، واتـە (تەدلیـسی ئیـسناد) ئیمـامی ئیبنـو سـەڵاح دەفەرموێت: كارێكی گەلێك قێزەونە، زۆربەی زانایان بە توندی دژی دەوەستن و بـە تـاوانی

دادەنێن. دەگێڕنەوە کە شوعبەی کوڕی حەجاج لە هەموو کەسێك زیاتر بێزی لە تەدلیس کردووەتەوە و دژایەتی تەدلیسکەرانی کردووە، تا ئەو رادەیەی کە چەن قسە و بۆچوونێکی لێ دەگێڕنەوە، کەوا دەردەبرێت تەدلیس بەلای ئەوەوە گوناحێکی گەورەیە و بەڵکو لە گوناحە گەورەکانیش گەورەترە، ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕ بە سەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە کە شوعبە جارێکیان فەرموویەتی: (تەدلیس برای درۆیە) و جارێکی تر فەرموویەتی: (تەدلیس کردنم بەلاوە خراپترە لە زیناکردن) و جارێکی تر فەرموویەتی: (سوێندم بە خوای گەورە، ئەگەر لە ئاسمانەوە بەریمەوە بۆ سەرزەوی، بەلامەوە خۆشترە لەوەی کە تەدلیس بکەم) و جارێکی تر فەرموویەتی هەروەکو ئیمامی شافیعی لێی دەگێڕێتەوە: (سوێند بە خوا زیناکردنم بەلاوە پێ ئاسانترە لە تەدلیسکردن)(١٢٨).

دیارە ئەم هەموو دژایەتییەی شوعبە خوای لێ رازی بێت بۆ تەدلیسکردن و دانانی بە خراپتر لە تاوانی گەورەی زیانکردن، هەر هەمووی وەکو ئیبنو سەلاح دەفەرموێت زیادەڕۆییە کە بۆ مەبەستی بۆگەن کردن و قێزەونی ئەو کارەیە لای خەڵکان و تۆقاندنیان لە توخن کەوتنی(١٢٩).

*　　　　　　*　　　　　　*

ئەمانە هەر هەمووی لە لایەك، بەڵام گەورەترین کارەسات ئەو بەڵایەیە کە تەدلیسکردن دەیهێنێت بەسەر تەدلیسکەردا دەربارەی حوکمی کەسایەتییەکەی و ئەو حەدیس و هەواڵانەی کە ئەو دوای تەدلیسکردنەکەی دەی گێڕێتەوە، چونکە کۆمەڵێك لە زانایانی حەدیس و شارەزایانی فیقهی ئیسلامی تەدلیسیان داناوە بە (تەجریح) بۆ تەدلیسکەرەکە، واتە بە بڕیار بۆ ئەوەی کە دوای تەدلیس کردنی، ئیتر بە هیچ جۆرێك هیچ ریوایەتێکی لێ وەرنەگیرێت، چ ئەوانەش کە تیایدا دەڵێت: بیستوومە ـ کە ئەمە رێشی تێناچێت کە

---

١٢٨ (التمهيد) ١/٢٠، وە (التقييد والايضاح) ١/٤٥٢ و (فتح المغيث للعراقي) ل٩٦.

١٢٩ (التقييد والايضاح) ١/٤٥٣، (الشذى الفياح) ٧٥ـ ٧٦.

تەدلیس بێت ـ، چ ئەوانەشی کە دانی بە بیستندا نەناوە تیایاندا، کە ئەمەیان لەوانەیە تەدلیس بێت.

واتە بە کورتی دوای ئەوەی کەسێك هەستا بە تەدلیس کردن ئیتر متمانە لە دەست دەدات و هەر قسەیەك بکات راست بێت یان درۆ، لێی وەرناگیرێت[١٣٠].

ئەم راوبۆچوونە شێخی گەورەمان ئیمامی ئیبنو سەلاح (خوای لێ رازی بێت) لە پێشەواکانی حەدیسەوە گێڕاویەتییەوە، مەبەستیشی وەکو حافیزی عێراقیش دەفەرموێت: ئەو کەسانەن، کە خاوەنی متمانەن، بەڵام تەدلیسیان کردووە، ئیتر دوای ئەوە هیچیان لێوەرناگیرێت، کەیفی خۆیانە راست بڵێن یان ناڕاست، وەکو باسمان کرد.

بەڵام دوای ئەمە هەر حافیزی عێراقی خۆی، رایەکی تری گوێزاوەتەوە لە ئەبی حەسەنی کوڕی قەتتان، کە گوایا ئەو فەرموویەتی: مادام حافیزە و متمانەدارە و راستگۆیە، ئەوە دوای ئەوەی کە تەدلیسی لێبینرا، متمانەکەی هەر دەمێنێ، بەڵام تەنها دەربارەی ئەو ریوایەتانەی کە تیایاندا دان دەنێت بە بیستنی فەرموودەکە لە دەمی شێخەکە، واتە ئەم جۆرەیانی لێ وەردەگیرێت، بەڵام لەو ریوایەتانەیدا کە دانی بە بیستندا نەناوە تیایاندا متمانەکەی لێ دەسەنرێتەوە و هیچی لێوەرناگیرێت[١٣١].

پاشان عێراقیی دەفەرموێت: ئەوەی بەناوبانگ و زانراو و پەسەندە لە نێوان زاناکاندا، ئەو رایەیە کە ئیبنو سەلاح گێڕایەوەو تەنانەت خەتیبی بەغدادیش لە (الكفاية[١٣٢])یەکەیدا لە گرووپێك لە زاناکانی حەدیس فیقهەوە، گێڕاویەتییەوە، هەروەها چەند کەسێکی تریش لە زاناکان، کەواتە رای راست و بەهێزی زۆربەی زانایان لێرەدا لەسەر ئەوەیە کە ئەو کەسەی تەدلیسی کرد ئیتر دوای ئەوە هەموو ریوایەتەکانی بەرپەرچ دەدرێتەوە[١٣٣] و لێی وەرناگیرێت، با جێگای متمانەش بێت، با دانیش بنێت بە بیستنی حەدیسەکەدا، ئەوەبوو ئیبنو سەلاح (خوای لێ رازی بێت) ئەو رایەی گێڕایەوە کە گوایا ریوایەتی تەدلیسکەر، بە

١٣٠ (التقييد والايضاح) ١/٤٥٤، (تدريب الراوي) ١٨٦.

١٣١ (التقييد والايضاح) ١/٤٥٤، (تدريب الراوي) ١٨٦.

١٣٢ الكفاية ٥١٥.

١٣٣ الشذى الفياح، ل٧٦.

هیچ جۆرێك وەرناگیرێت، حافیزی عێراقییش پشتگیری کرد و بە پەسەند و رای زۆربەی زانایانی زانی.

بەڵام دوای ئەمە ئیبنو سەلاح خۆی دەگەڕێتەوە سەر باسەکە و سەرلەنوێ لێی دەدوێتەوە و دەفەرموێت: ئەوەی راستی بێت ئەوەیە کە لێرەدا یەك حوکم نەدەین بەسەر هەموو ریوایەتەکانی تەدلیسکەردا، یەڵکو لێکیان جیابکەینەوە، بەم جۆرە هەر شتێکی گێڕایەوە بە جۆرێك کە جێگای گومان بوو، دانی تیادا نەنابوو بە بینینی شێخەکە و بیستنی فەرموودەکە لێی، ئەوا ئەو حەدیسە حوکمی حەدیسی (مورسەل)و جۆرەکانی دەدەینێ، هەرچیشی گێڕایەوە و دانی تیادا نا بە بینین و بیستن لە شێخەکەی، بەم جۆرە وتبووی: (سمعتُ) یان (حدَّپنا) یان (أخبرنا) یان وێنەی ئەمانە، ئەوە لێی وەردەگرین.

بەڵگەشمان لەسەر راستی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا و غەیری ئەوانیشدا ژمارەیەکی زۆر لە حەدیسی ئەم جۆرە کەسانەی تیادایە، وەکو قەتادە و ئەعمەش و هەردوو سوفیان و هوشەیمی کوڕی بەشیر و عەبدوڕەزاق و موسلیمی کوڕی وەلید کە تەدلیسیان کردووە لە حەدیسەکانی تریاندا، بەڵام ئەوانەی کە بە بیستن دانیان تیادا ناوە، لێیان وەرگیراوە، تەنانەت لەو دوو پەرتووکەشدا کە لە هەر هەموو گۆی زەویدا بەس قورئانی پیرۆز بۆ راست و دروستی لە پێشیانەوەیە، چونکە لە راستییدا تەدلیس درۆ نییە، بەڵکو جۆرێکە لە هەڵخەڵەتاندن بە وشە و شێوازێکە کە زیاتر لە یەك مەعنا هەڵبگرێت[١٣٤].

* * *

لە راستییدا ئەم جیاوازییکردنەی کە ئیبنو سەلاح باسی کرد لە نێوان ریوایەتەکانی تەدلیسکەردا، زانایانی حەدیس لەگەڵیدا کۆکن دەربارەی ئەو کەسەیان کە دان ئەنێت بە بیستندا، بە وشەی وەکو (سمعتُ) یان (حدَّثنا)، دەفەرموون: مادام دانی بە بیستندا ناوە،

---

[١٣٤] (التقييد والايضاح) ١/٤٥٥، (الشذى الفياح) ل٧٦.

حەدیسەکەی لێ وەردەگرین، ئەمە رای ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕیشە لە تەمهیددا، هەروەها لە یەحیای کوڕی موعین و عەلی کوڕی مەدینی[١٣٥] شەوە دەیگێڕنەوە[١٣٦].

بەڵام وا دیارە دەربارەی ئەو کەسەیان کە دان نانێت بە بیستندا، لەگەڵیدا نین، ئیبنو سەلاح فەرمووی: حوکمی حەدیسی ئەم کەسە وەکو حەدیسی مورسەل وایە، بەڵام ئەوەی کە لە فەرموودەکانی ئیبنوعەبدولبەڕەوە وەردەگیرێت ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێك حەدیسی تەدلیسکەر حوکمی حەدیسی مورسەلی نادرێتێ، وەکو دەفەرموێت:

"ئەو کەسەی ناسراوە بە تەدلیسکەر و لەو کەسانە بوو کە چاوپۆشی نەدەکرد لە لابردنی ناوی شێخەکەی، بەبێ جیاوازی لە نێوان بەهێز و بێ هێزدا، ئەوە بە هیچ حەدیسێکی ئەو بەڵگە ناهێنرێتەوە مەگەر ئەوانەی کە تیایاندا دانی بە بیستندا ناوە"[١٣٧].

کەواتە ئەوانەی کە دانی تیادا نەناوە بە بیستن، ئەوانە بە هیچ جۆرێك وەرناگیرێن بە گوێرەی ئەم فەرموودەیەی ئیبنو عەبدولبەڕ، کەواتە چۆن ئیبنو سەلاح فەرمووی ئەم جۆرەیان حوکمی حەدیسی مورسەلی هەیە کە لەکاتێکدا زۆربەی زانایان مورسەل وەردەگرن؟!!

شێخی عێراقیش خوای لێ رازی بێت لێرەدا روونکردنەوەیەکی جوانی فەرمووە دەربارەی فەرموودەکەی ئیبنو سەلاح کە گوایە حەدیسی ئەو تەدلیسکەرەی کە دانی بە بینین و بیستندا نەناوە حوکمی حەدیسی مورسەلی هەیە، لێرەدا عێراقی دەفەرموێت: ئەم قسەیەی ئیبنو سەلاح ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسانەی حەدیسی مورسەل وەردەگرن و کاری پێ دەکەن، لە هەمان کاتیشدا حەدیسی موعەنعەنی تەدلیسکەریش وەردەگرن، واتە ئەوەی کە تیایدا نەیوتووە (سمعت) یان (حدثنی)، بەڵکو (عن فلان ـ عن فلان هتد) کە لە راستییدا ئەم قسەیە وانییە، چونکە هەموو ئەو کەسانەی کە بەڵگە بە حەدیسی مورسەل دەهێننەوە، حەدیسی تەدلیسکراویان لا پەسەند نییە، لەبەرئەوەی گرووپێك لەوانەی کە

---

[١٣٥] عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری ئەبوحەسەنی مەدینی، یەکێکە لە پێشەواکان و خاوەنی ڕا و بۆچوونە لە هەڵسەنگاندندا، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٢٤٦/١، (سير أعلام النبلاء) ٤١/١١.

[١٣٦] (التمهيد) ٢١/١ و (تدريب الراوي) ١٨٦.

[١٣٧] (التمهيد) ٢١/١.

باوەڕیان بە مورسەل هەیە و کاری پێ دەکەن، حەدیسی تەدلیسکراو وەرناگرن و پەسەندی ناکەن، لەبەرئەوەی وادەزانن کە مرۆڤی تەدلیسکەر گومانی ناپاکی و دڵپیسی لێ دەکرێت، لەبەرئەوەی کارەکە بە شەفافی ناکات و خەڵکی چەواشە دەکات و کاروباری دینەکەیان دەشێوێنێ و زۆربەی کات شتێکی ناڕاستیان لە چوارچێوەی شتێکی ڕاستدا پیشان دەدات[138].

ئەم ڕاستییە کە لێرەدا روون کرایەوە، خەتیبی بەغدادیش (خوای لێ ڕازی بێت) درکاندوویەتی و لە گرووپێك لە زانایانەوە گێڕاویەتییەوە لە (الکفایة)دا فەرموویەتی[139]:

"لە ڕاستییدا زۆربەی ئەوانەی حەدیسی مورسەل وەردەگرن، حەدیسی کەسانی تەدلیسکەریش وەردەگرن".

کەواتە لە فەرموودەکەیەوە وەرگیرا کە کۆمەڵێك هەیە لە وەرگرانی مورسەل، حەدیسی تەدلیسکەر وەرناگرن.

بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کە تا زیاتر دەچێتە پێشەوە، دەبینیت قوڕەکە شل تر دەبێتەوە، ئەوەبوو ئیبنو سەڵاح فەرمووی: (ئەو حەدیسەی کە خاوەنەکی دانی نەناوە بە بیستندا لە شێخەکەی، بە چاوی حەدیسی مورسەل سەیری دەکەین و حوکمی ئەوی دەدەینێ).

ئەوەش بوو لەسەر ئەم فەرموودەیەی گلەیی هاتە سەر و وتیان ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو ئەو کەسانەی کە کار بە مورسەل دەکەن لە هەمان کاتدا کاریش بە تەدلیسکراو دەکەن، بەڵام وانییە، چونکە باوەڕداران بە مورسەل، بوون بە دوو بەشەوە بەرامبەر بە حەدیسی تەدلیسکەر، هەندێکیان وەری دەگرن و هەندێکیشیان وەری ناگرن، کەواتە ئەم کۆمەڵە بەرامبەر (مورسەل) هەردوو تاکی دەرگاکەیان خستووەتە سەرپشت، بەڵام بۆ (مودەلەس) تاکێکیان داخست و تەنها تاکێکیان هێشتەوە.

---

[138] (التقیید والایضاح) ١/٤٥٥، و (الشذی الفیاح) ل٧٧.

[139] (الکفایة) ل٥١٥.

دوای وەرگرتنی ئەم زانیارییانە دەبینین کە ئیمامی نەوەوی (خوای لێ رازی بێت) ئاوا بۆ باسەکە چووە کە هەردوو تاکی دەرگاکەی لەسەر (تەدلیسکراو) داخستووە، بڕیاری وەرنەگرتنی کۆ دەنگیی زانایانی بۆ دەرکردووە، لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: "هەموو زانایان بە گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی کە حەدیسی تەدلیسکەر وەرناگیرێت، ئەگەر دانی نەنا بە بیستندا"[١٤٠]. کە دیارە ئەمەی ئەم فەرموویەتی ئەو جۆرە دەگرێتەوە کە ئیبنو سەلاح فەرمووی حوکمی حەدیسی مورسەلی هەیە و پاشان روونمان کردەوە کە هەندێك لە وەرگرانی مورسەل ئەو جۆرە مودەلەسە وەردەگرن.

باشە زۆر سەیرە ئەم ئیمامە گەورە بەڕێزە بەهێزە ئەم (اجماع)ەی لە کوێ هێنا؟ هەڵبەتە بناغەیەکی بینیوە بۆ ئەوەی لەسەری دابنێ.

لەراستییدا هەرواشە، بناغەیەك هەیە، بەڵام بەدەستی وەستای باشو کارامە داڕێژراوە و لەبەرئەوەی بینەرانی تا بڵێی بە پتەوی دەزانن و چینی لەسەر دائەنێن.

شێخی عێراقی ئاماژە بۆ ئەو بناغەیە دەکات و دەفەرموێت: وا دیارە ئەوەی کە نەوەوی خستووەتە سەر ئەم باوەڕە و ئەمەی پێ فەرمووە، ئەو فەرموودەیەی (بەیهەقی)[١٤١]یە کە لە (المدخل)دا فەرموویەتی و ئەو روونکردنەوەیەیە، کە ئیبنو عەبدولبەڕ لە (التمهید)ا کردوویەتی، کە هەردوو قسەکە ئەوەیان لێ وەردەگیرێت، کە نەوەوی نووسیەتی:

دەربارەی فەرموودەکەی بەیهەقی ئەوەیە کە لە ئیمامی شافیعییەوە و (باقی) زانایانەوە، گێڕاویەتییەوە، کە ئەوان عەنعەنەی تەدلیسکەر، واتە ئەوەی دانی بە بیستندا نەناوە تیایدا، وەرناگرن)[١٤٢].

فەرموودەکەی ئیمامی شافیعیش بەم جۆرەیە:

"ئەو کەسەی کە جارێك تەدلیسمان لێ بینی، ئەوە عەیبی خۆی پیشان داوین، ئەو عەیبەش بە درۆ نازانرێت تاوەکو ریوایەتەکانی بەر پەرچ بدەینەوە، ئامۆژگاری راستگۆیانەش نییە، تاوەکو بێ چەندو چوون لێی وەربگرین، لەبەرئەوە بڕیارمان دا کە هەر

---

١٤٠ (التقييد والايضاح) ٤٥٥/١.

١٤١ (بەیهەقی)

١٤٢ (التقييد والايضاح) ٤٥٥/١ وە (الشذى الفياح) ل٧٧.

کەسێك حەدیسێکی تەدلیس کرد، ئیتر هیچ شتێکی لێ وەرناگرین مەگەر ئەوەی کە تیایدا وتبێتی (حدَّثني) یان (سمعت)"[١٤٣].

کەواتە نەوەوی ناحەقی نەبوو کە ئاوای فەرموو، دەربارەی فەرموودەکەی ئیبنو عەبدولبەڕیش ئەوەیە، کە ئەو لە کاتی باسکردنی زنجیرەی حەدیسی موعەنعەندا فەرموویەتی "ئەم حەدیسە بە سێ مەرج وەردەگیرێت: یەکەمیان دەبێت کەسەکانی زنجیرەی سەنەدەکەی دادپەروەر و بێ لەکە بن، دووەمیشیان دەبێت بە یەکتری گەیشتبن[١٤٤]، دانیشتبن پێکەوە یان هەر یەکترییان بینیبێت، سێهەمیشیان دەبێت هەرگیز تەدلیسیان نەکردبێت".

پاشان هەمان را دوای چەند دێڕێك دووپات دەکاتەوە و دەفەرموێت:

"حەدیسەکەی وەردەگیرێت مەگەر ئەو کەسە ناسراو بێت بە تەدلیسکردن، گە ئەگەر وەهابوو ئەوا حەدیسەکەی لێوەرناگیرێت تاوەکو نەڵێت: (حدَّثنا) یان (سمعت) واتە دان نەنێت بە بیستندا"، پاشان دەفەرموێت: "ئەمەش شتێکە کە هیچ ناکۆکییەکی زاناکانم تێدا نەبیستووە"[١٤٥].

کە دیارە ئەم رستەیەی دوایی ئەوەی لێوەردەگیرێت کە مادام زانایان ناکۆك نین لەسەر ئەم رایە، مانای وایە هەموویان بە کۆی دەنگ حەدیسی تەدلیسکەر رەت دەکەنەوە، کەواتە لێرەدا (اجماع) بەسترا لەسەر بڕیارەکە.

کە ئەمەش وامان لێدەکات کە جارێکی تریش ناحەقی نەوەوی نەگرین بۆ فەرموودەکەی.

بەم جۆرە شێخی عێراقی دوو بناغەی بەهێزی جوانی بۆ بۆچوونەکەی ئیمامی نەوەوی دۆزییەوە، کەچی دەبینیت کە عێراقی بەمانەش وازناهێنێ و دڵی ئاو ناخواتەوە، بەڵکو دەگەڕێت بە دوای پشتگیری زیاتردا بۆ ئیمامی نەوەوی و سەلماندنی بۆچوونەکەی کە

---

١٤٣ (الرسالة) دانراوی ئیمامی شافیعی ل٣٧٩.

١٤٤ (التمهيد) ١/١٨.

١٤٥ (التمهيد) ١/١٨.

**(إجماع) هەیە لەسەر وەرنەگرتنی حەدیسی تەدلیسکەر، کە جارێکی تریش هەڵ دەچێتەوە لە باسەکە و دەفەرموێت:**

**"لەوانەیە ئەو فەرموودەیەی نەوەوی کە وتی: هەموو زانایان کۆکن لەسەر وەرنەگرتنی حەدیسی تەدلیسکەر، رێی تێدەچێ کە مەبەستی ئەو زانایانە بێت، کە حەدیسی مورسەل وەرناگرن و نایکەن بە بەڵگە"[146][147].**

---

[146] (التقييد والايضاح) ١/٤٥٦، و (تدريب الراوي) ل١٨٦.

[147] لەم فەرموودەیەوە ئەوە وەرگیرا کە هەندێ لە زانایان باوەڕیان بە حەدیسی مورسەل نییە و وەکو بەڵگە لەسەر چەسپاندنی حوکم بەکاری ناهێنن، لە راستیشدا هەروایە، لەبەرئەوەش کە بینیمان ئیمامی ئیبنو سەلاح حوکمی حەدیسی مورسەلی بەخشی بەو حەدیسەش کە تەدلیسی تیادا کراوە لە هەندێ وێنەیدا. کەواتە لێرەدا جێگای خۆیەتی کە تیشکێك بخرێتە سەر حەدیسی مورسەل و مەبەستی زانایان لەم جۆرە حەدیسە و هەروەها روونکردنەوەی حوکمەکەی لەلای زانایانی حەدیس و ئوسوڵ و فیقهی ئیسلامیی.

ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕ لە پێناسەی حەدیسی مورسەلدا دەفەرموێت: "ئەم ناوە بە کۆی دەنگ نراوە لە حەدیسی تابیعییەکی گەورە ـ کەسێکە کە ژمارەیەکی زۆری لە صەحابە بینیبێت ـ لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) راستەوخۆ فەرموودە بگێڕێتەوە، وەکو ئەوەی کە کەسێکی وەکو (عەبدوڵلا کوڕی عامری کوڕی رەبیعە)، یان (سالمی کوڕی عەبدوڵلا)، یان (عەلقەمەی کوڕی قەیس)، هەر کەسێکی تریش کە لە ئاستی ئەماندا بن، لەو هەموو تابعییانەی کە بێگومانین لەوەی کە ژمارەیەکی زۆریان لە سەحابە بینیوە، ئەم جۆرە کەسانە بێتو بڵێن: (پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی).

بەڵام ئیمامی نەوەوی پێناسەی حەدیسی مورسەلی کردووە بە گشتی تر لەم پێناسەیەدا، دەفەرموێت: "مەبەستی ئێمە بە حەدیسی مورسەل ئەو حەدیسەیە کە پچڕان کەوتبێتە سەنەدەکەیەوە و یەکێك یان زیاتر لە گێڕەرەوەکانی تیادا نەمابێت، ئینجا کەیفی خۆیەتی ئەو کەسە لابراوە سەحابی بێت یان کەسێکی تر".

پاشان نەوەوی باسی حوکمی مورسەل دەکات و دەفەرموێت: "ئەو حەدیسەی کە مورسەل بێت ناکرێت بە بەڵگە، نە لە لای ئێمە ـ مەبەستی شافیعییەکانە ـ نە لەلای بەشی زۆری زانایانی حەدیس و کۆمەڵێك لە سەحابەکان و زۆربەی زانایانی ئوسوڵ، هەروەها ئەبوعەبدوڵلای حاکم ئەم رایەی گێڕاوەتەوە لە هەریەك لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە و ئیمامی مالیك و کۆمەڵێك لە زانایانی حەدیس و شارەزایانی فیقهی ئیسلامی لە حیجاز، خاوەنانی ئەم رایە چەن بەڵگەیەکیان لەسەر بۆچوونەکەی خۆیان هێناوەتەوە، وەکو:

١ـ ئێمە کۆکین لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك حەدیس بگێڕێتەوە لە کەسێکەوە کە نەی ناسین، ئەوا حەدیسەکەی لێ وەرناگرین، لەکاتێکدا کە ئەو کەسە ناوی ئەو کەسە نەناسراوەشی بۆ هێناوین، لەبەرئەوەی نازانین کێیە و

حاڵوباڵی چۆنە، جا لە کاتێکدا کە ئەم کەسە نە ناسراوە بەناوبردنیشەوە حەدیسەکەی ڕەت بکرێتەوە، ئەوا حەدیس لە کەسێکی ناو نەبراوەوە باشتر و چاکتر شایانی وەرنەگرتنە.

٢ـ هەموو زانایان کۆکن لەسەرئەوەی کە پێویستە دڵنیابین لە دادپەروەری و متمانەپێکراوی ئەو کەسەی کە حەدیس دەگێڕێتەوە، کەواتە ئەگەر کەسێك شت بگێڕێتەوە لەکەسێکەوە کە نەی بینیوە، ئەوا ناچار هەر دەبێت لە کەسێکی نێوانیانەوە بێت، بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لە ڕێکوپێکی و ڕاستگۆیی ئەو کەسەی کە نەیدیوە، چونکە لەوانەیە گێڕانەوەکە لە کەسێکی لاواز و بێ متمانەوە بێت، کەواتە لێرەدا حەدیسی ئەو کەسەی کە ئیرسالی کرد پووچەڵ بووەوە، چونکە نازانین کەسی نێوان خۆی و ئەوەی دواوەی چۆن کەسێکە.

٣ـ ئەگەربێتو ئێمە حەدیسی مورسەل وەربگرین دەبێت، هەروەها ئەوەش وەربگرین کە کاتێك کەسێکی وەکو مالیك و شافیعی و ئەوزاعی و وێنەی ئەمانە حەدیس بگێڕنەوە و بڵێن: (قال رسول الله ﷺ)، ئەگەر ئەم گێڕانەوەیەش بۆ ئەمان دروست بێت، دەبێت بۆ هەموو کەسێکی تریش لە دوای ئەوان لەهەر چەرخێکدا بێت هەر بە دروست دابنرێت، کە دیارە بەمەش کار لە کار دەترازێت و بابەتەکەش لە گێژەنکە دەردەچێت، ئەوەی کە جێگای شانازی هەموانە و پێی دەوترێت گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێت)، تامی تیانامێنێت و بە تەواوی کاڵ دەبێتەوە.

٤ـ هەموو زانایان کۆکن کە ناتوانرێت گەواهی لەسەر گەواهی بدرێت جگە لە ڕێگای یەکتربینینەوە نەبێت، کەواتە دەبێت وەرگرتنی فەرموودەکانی حەزرەتیش هەر ئاوەها بێت، چونکە ئەمەش جۆرێکە لە بڕیاردانی حوکم و هەروەکو گەواهی وەهایە).

شایانی باسیشە کە ئیمامی شافیعی هەندێ حەدیسی مورسەلی جیاکردووەتەوە، بۆ ئەوەی کە بیان کات بە بەڵگە و لە چەسپاندنی ئەحکامدا بەکاریان بهێنێت، ئەوانەش ئەو مورسەلانەن کە چەن مەرجێکیان تێدایە، کە دەبێت بەهۆی بەهێزبوونیان و شایانی ئەوەی کە پشتیان پێ ببەسترێت.

لە ڕاستییدا ئیمامی نەوەوی لە (مجموع)ەکەیدا دەقێکی لە ئیمامی شافیعییەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەم ڕاوبۆچوونەی دەربارەی حەدیسی مورسەل، شافیعی دەفەرموێت: "بەڵگە دێنمەوە بە حەدیسە مورسەلەکانی تابیعییە گەورەکان ئەگەر لەلایەکی ترەوە و ئیسنادێکی دیکەوە گەیەنرابوو بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) یان کەسێکی دیکەش بە مورسەلی هێنابووی، بەڵام بە مەرجێك کە کەسەکانی ناو سەنەدەکەی جیاواز بن لە کەسەکانی سەنەدەکەی دیکە، لەو کەسانەش بن کە جێگای متمانە بن و شایانی ئەوە بن زانیارییان لێ وەربگیرێت، چونکە لەم کاتەدا مورسەلەکە پشتگیری دەکرێت بە مورسەلێکی تر و یەکتری بەهێز دەکەن، یان وەری دەگرم لەبەرئەوەی کە ئەو حەدیسە مورسەلە کۆك و گونجاو بوو لەگەڵ فەرموودە و ڕا و بیروبۆچوونی هەندێ لە سەحابەکاندا، یان وەری دەگرم لەبەرئەوەی کە زاناکان بە گوێرەی ڕا و سەرنجی ئەو مورسەلە فەتوایان دابوو، با بشزانرێت کە من حەدیسی مورسەلی کەسانی دیکە ـ جگە لە تابعییە گەورەکان ـ وەرناگرم، هەروەها دەهێنێ

ئەوانیش وەرنەگرم مەگەر بە پشتگیری کردنی یەکێك لەو چوار مەرجەی باس کرا، لێرەشدا جیاوازی نییە لە نێوان مورسەلی سەعیدی کوڕی موسەیب و مورسەلی کەسێکی تردا".

* * *

بەلاَم کۆمەڵێك لە ئیمامەکانی تری وەکو ئەبوحەنیفە و ریوایەتێك لەهەریەك لە مالیك و ئەحمەددەوە و زۆر لە شارەزایانی فیقهی ئیسلامی باوەڕیان بە مورسەل هەیە و بەڵگەی پێ دەهێننەوە، تەنانەت ئیمامی غەزالی لە موستەسفادا ئەم ڕایەی لە جەماهیرەوە گێڕاوەتەوە، بەڵکو هەندێ لە مالیکییەکان لێرەدا زیادەڕەوییشیان کردووە و وتوویانە: حەدیسی مورسەلی ئەو کەسەی کە متمانەدار و باوەڕپێکراوە، چاکتر و بەهێزترە لەو حەدیسە کە مەرفوعە و بەرزکراوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت). بەڵگەشیان ئەوەیە کە گوایە ئەو کەسەی ناوی کەسێك لە دوای خۆیەوە دێنێ، ئەوا دەتنێرێت بۆ گەڕان‌و پشکنین دەربارەی حاڵ و کەسێتی ئەو کەسە، بۆ ئەوەی کە بە دڵی خۆت لێی بکۆڵێتەوە و دڵنیا بیت، بەلاَم ئەو کەسەی کە ناوی کەسەکەی پێش خۆی ناهێنێ و لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی ئاییندار و زانا و متمانەپێکراوە، ئەوە مانای وایە کە بۆی سەلماندویت کە حەدیسەکە ڕاستە و جێگای گومان نییە، چونکە ئەو خۆی لە باتی تۆ هەستاوە بە ئەرکەکە و هەموو لایەنێکی پێویستی پشکنیووە و ئەوەی دەبێ بکرێت کۆڵینەوەی تیادا کردووە.

ئەمەی تا ئێرە باس کرا، کرۆك و پوختەی ئەوەبوو کە هەریەك لە ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕ لە (تەمهید)دا و ئیمامی نەوەوی لە (المجموع)دا باسیان کردووە، بەلاَم لە دوای ئەم باسە، خاوەنی (تەمهید) باسێکی تر دەدرکێنێت، کە وات لێ بکات دوو هەڵوێست وەربگریت:

یەکەمیان باوەڕهێنان بە بەهێزی ئەو ڕایەی کە دەڵێ حەدیسی مورسەل ناکرێت بە بەڵگە.

دووەمیشیان سەرسوڕمانت لە هەڵوێستی ئەو کەسانەی کە مورسەل بە بەڵگەدا دەدنێن، کەچی لە کاتێکدا دەکەونە ناکۆکییەوە لە حوکمی باسێك لە باسەکاندا، ڕازی نابن کە بەرامبەرەکانیان، بەڵگە بە حەدیسی مورسەل بهێننەوە، بەڵکو داوای بەڵگەیان بە حەدیسی (مەرفوع)و بەرز کراوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لێ دەکەن، ئیمام لێرەدا دەفەرموێت:

"پاشان من بە وردی بیرم کردووەتەوە لە کتێبەکانی ئەو کەسانەوە کە وتووێژ دەکەن لەو باسانەدا کە تیایاندا ناکۆکن، لە کەسانی شەرعزان و پیاوانی حەدیس، چ لەوانەی خۆمان کە لەسەر ڕێبازی ئیمامی مالیکن، چ لە کەسانی دیکەش، کەچی نەم بینیوە یەکێکیان ڕازی بێت لە بەرامبەرەکەی کە بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر ڕاکەی، بە حەدیسی مورسەل، بە هیچ جۆرێك حەدیسی سەنەدپچڕاوی لێ وەرناگیرێت و داوای بەڵگەی بە حەدیسێك لێ دەکات کە بەبێ پچڕان گەیەنرابێتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت).

**٢ـ حوكمی تەدلیسی شیوخ:**

هەرچەندە زانایان ڕایان وایە کە خراپیی ئەم جۆرە تەدلیسە کەمترە لە خراپیی تەدلیسی ئیسناد، بەڵام ئەمیشیان هەر بەلاوە بێزراو و ناپەسەندە، چونکە ئەمیش دەبێت بە هۆی نەمانی شەفافییەت لە ناسینەوەی شێخەکەدا و دروستکردنی تەمومژ و دوکەڵێك لەبەرچاوی هەموو ئەو کەسانەدا کە بیانەوێت لێکۆڵینەوە لە خاوەنی حەدیسەکە بکەنەوە، بۆ دڵنیابوون لە ئایین و متمانە و ڕای ڕەخنەگران بەرامبەری، لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێ بزانین لە پلە و نمرەی خراپی ئەم تەدلیسە دەگۆڕێت بە گوێرەی گۆڕانی مەبەستی تەدلیسکەرەکە، چونکە هەندێ مەبەست هەیە کە لە پشتێویە و ناپاکییەکی وەها خۆی شاردووەتەوە، کە بە هیچ جۆرێك بواری چاوپۆشی لێ کردنی پێنادرێت. کە لەوانەیە گرنگترینی ئەو مەبەستانەی کە پاڵ دەنێت بە تەدلیسکەرانەوە بۆ هەستان بە کارەکەیان، ئەمانەی خوارەوە بن:

١ـ لەوانەیە لەبەرئەوە تەمومژ لەبەردەم ناسینەوەی شێخەکەیدا بکات، چونکە کەسێکی لاواز و بێ متمانەیە و زانایانی شارەزای حەدیس فەرموودەی لێ وەرناگرن و باوەڕیان پێی نییە، لەبەرئەوە ناوەکەی ون دەکات تاوەکو هەستی پێ نەکەن کە ئەمە فلان کەسە.

٢ـ یان لەبەرئەوەیە کە شێخەکەی لەم دواییەدا مردبێت لەبەرئەوە چەندان منداڵ و دەم ڕووت، حەدیسیان لێ وەرگرتبێت کە ئەم خۆی لە ئاستی ئەواندا نابینێت، لەبەرئەوە ناوی شێخەکەی نابات و ئاشکرای ناکات.

---

دیارە ئەمەش بۆیە وایە، چونکە هەمیشە بەربەرەکانێ و ناکۆکی لە نێوان کەسێکدای کە باوەڕی بە مورسەل هەیە و کەسێکی دیکەدا کە باوەڕی پێی نییە، جا ئەگەر کەسێك کە خۆی بە بەڵگەی دادەنێ، بیکات بە بەڵگە بەرامبەر کەسێك کە بە بەڵگەی دانانێت، ئەوا بەرامبەرەکەی پێی دەڵێت ئەمە ناخوا، بەڵگەیەکی دیکە بهێنە، چونکە لە راستییدا ئەمە بنچینەی ناکۆکییەکەی نێوان من و تۆیە و ئێمە بە بەڵگەی نازانین. ئەگەر کەسێکیش بەڵگەی پێ بهێنێتەوە کە خۆی بە بەڵگەی نازانێت بەرامبەر کەسێك کە ئەو کەسە بە بەڵگەی دەزانێت، ئەوا بەرامبەرەکەی پێی دەڵێت باشە تۆ چۆن بەڵگەم بۆ دەهێنیتەوە بە دەقێك کە خۆت بە بەڵگەی نازانیت؟ برۆ لەو جۆرە بەڵگانەم بۆ بهێنە کە بەلای خۆشتەوە بەڵگەن.

بڕوانە: (التمهيد) ١/١١، و (المستصفى)١/١٦٩، و (المجموع شرح المهذَّب) ١/٦٥.

٣ـ یان لەبەرئەوەیە کە شێخەکەی تەمەنی لە خۆی کەمترە و منداڵ ترە، لەبەرئەوە پێی شەرمە کە خەڵکی بەوە بزانن کە ئەم لەویش گەورەترە و کەچی قوتابی ئەویشە.

٤ـ یان لەبەرئەوەیە کە زۆری ریوایەت لێوە دەکات و حەدیسی لێ دەگێڕێتەوە و پێی خۆش نییە خێرا خێرا ناوەکەی دووپات بکاتەوە، لەبەرئەوە هەر جارەی بە ناوێك ناوی دەبا، بەڵام وابێت کە ڕەوانبێژی عەرەبیش پشتگیری لەم دووپات نەکردنەوەیە دەکات و دووبارە کردنەوەی یەك قسە بە جوان نازانێت مەگەر بۆ مەبەستی (تەوکیدی لەفزی).

٥ـ یان لەبەرئەوەیە کە زیرەکیی خەڵکان تاقی بکاتەوە و بزانێ تا چ رادەیەك شارەزاییان هەیە لە زانستی (رجال الحدیث)دا و چەندە دەربارەی ناو و نازناو و وڵات و شار و گوند و پیشەکانیان، زانیارییان لایە.

٦ـ یان بۆ مەبەستی پیشاندان و دەرخستنی هونەرمەندیی خۆیەتی لە دەربڕیندا، کە گوایا دەتوانێت چەندان ناو داتاشێت بۆ تاکە کەسێکیش.

٧ـ یان لەبەر ئەوەیە کە خۆی هەڵکێشێت و خەڵکان وا هەست بکەن کە بەڕێزی مرۆڤێکی ئایین پەروەر و دڵسۆزی قورئان و حەدیس و زانیارییەکانیانە، ئەوەتا لەو پێناوەدا چەندین گەشت و کۆچی شاران و وڵاتان ئەنجام دەدا لە پێناوی بە حزمەت گەیشتنی شێخەکانی حەدیسدا و وەرگرتنی فەرموودەکان راستەوخۆ لە زاری خۆیان، چونکە ئەم جۆرە کۆچانە لەو سەردەمانەدا بە جێگای شانازی دانراوە.

٨ـ یان دێنێ سێ چوار ناو لە کەسێك دەنێ کە خەڵکی نەزانن ئەمانە هەموویان هەر بریتین لە کەسێك، تاوەکو وا خۆی پیشان بدات کە مامۆستای زۆرە و بە خزمەتی ژمارەیەکی بەرز لە شێخەکان گەیشتووە، کە دیارە ئەم خاڵەش لە کاتی خۆیدا بە لایەنێك لە لایەنەکانی شانازی کردن دانراوە.

٩ـ یان لەبەرئەوەیە کە ناخۆشی و دڵ ئێشانێك لە نێوان ئەم و شێخەکەیدا رووی دابێت و لێك تۆرابن و دابڕابن، لەبەر ئەوە نەیەوێت ناوی بهێنێ.

١٠ـ يان لەبەرئەوەی کە تەدلیسکەر کەسێکی حەسوودە و نایەوێت شێخەکەی بە خەڵکان بناسێنێت و ناوەکەی تەمومژاوی دەکات، تاوەکو نەزانن کێیەو نەچنە خزمەتی و حەدیسی لێ وەرنەگرن[١٤٨].

پاشان زانایان دەربارەی حوکمی ئەم جۆرە تەدلیسە و وەرگرتنی حەدیس و وەرنەگرتنی لە خاوەنەکەی، هەر توندوتیژن و نەرمی نانوێنن و دەفەرموون.

ئەگەر لەسەر ئەوە ناوی شێخەکەی شێواند و خەڵکی بەرامبەری لە ناسینەوەی سەرگەردان و بەرچاو لێڵ کرد، چونکە خۆی دڵنیایە لەوەی کە شێخەکەی کەسێکی درۆزن و بێ متمانەیە و زانایان بە شایانی نازانن بۆ گێڕانەوەی حەدیس، ئەوا لەم کاتەدا نابێت حەدیسەکەی لێ وەربگیرێت، چونکە هۆکاری تەدلیس کردنەکە ناپاکی و دەستدرێژی کردنە بۆ سەر بنەماکانی ئایین و باوەڕ.

هەروەها دەفەرموون هەر نابێت لێی وەربگیرێت لەو کاتەشدا کە خۆی شێخەکەی بە متمانەدار بزانێت، بەڵام خەڵکانی تر بە کۆی دەنگ بە لاوازی دەزانن و متمانەی پێ نابەخشن، چونکە کێ دەڵێت ئەوان گەلێ زانیاری بەسوودی وایان لەلانییە دەربارەی ئەو شێخە، کە لاوازییەکەی دەسەلمێنێت و ئەم ئەو زانیارییانەی نەبیستووە و نایان زانێت؟

دەربارەی مەبەستەکانی تریش زانایان پێیان پەسەند نییە، هەموو بە هۆکاری چەواشەکردنی خەڵکان و بەرچاولێڵ کردنیان دەزانن، لەبەرئەوە دەبێت حەدیسەکە رابگیرێت و کاری پێ نەکرێت، تاوەکو بە تەواوی لێکۆڵینەوە لە شێخەکە دەکرێت، کە ناوکەی چەواشە کراوە[١٤٩].

---

[١٤٨] بۆ ئەم مەبەستانەش بڕوانە: (التقييد والايضاح) ١/ ٤٥٦، فتح المغيث للعراقي ل٩٤، تدريب الراوي ل١٨٨، جامع التحصيل ل١٠٤، موسوعة علوم الحديث ١/ ٤٥٠ و ١/ ٢٧٨.

[١٤٩] تدريب الراوي ل١٨٧.

**٣ـ حوکمی تەدلیسی تەسویە:**

ئەم جۆرە تەدلیسە زۆر بە توندی دژایەتی کراوە لە لایەن زاناکانی حەدیسەوە، بگرە شێخی عێراقی (خوای لێ رازی بێت) بە خراپترینی هەموو جۆرەکانی دادەنێت و دەفەرموێت: ئەم جۆرە لە خۆبایی بوونێکی بێ تامی تیادایە، ئەویش لەوەدا کە متمانەدارەکەی یەکەم، لەوانەیە لەو کەسانە نەبێت کە تەدلیس دەکەن، لەگەڵ ئەمەشدا تەدلیسکەر دانی ناوە بەوەدا، کە حەدیسەکەی لەم متمانەدارە بیستووە، کە لە هەمانکاتدا راستیش دەکات، کەواتە لێرەدا هیچ کەسێك گومانی تەدلیسی لێ ناکات، هەرکەس چاوی بە زنجیرەی سەنەدەکە دەکەوێ بە هیچ جۆرێك عەیبێکی تیادا نابینێت، ئەوش لەبەر ئەم سێ لایەنە:

**یەکەمیان:** داننانی تەدلیسکەر بە بیستنی حەدیسەکەدا لە زاری شێخەکەی.

**دووەمیان:** ئەو متمانەدارەی دوایەوە هیچ کەسێك لە ژیانیدا تەدلیسی لێ نەبیستووە، لەبەرئەوە کەس بۆ ئەوە ناچێت کە تەدلیس لە ئارادا بێت.

**سێهەمیشیان:** کەسانی ناو زنجیرەکە هەر هەموویان متمانەدارن، ئیتر چوزانن کە دوای متمانەداری یەکەمیان لاوازێك هەبووە و سەرنگوم کراوە، لەبەرئەوە بڕیاری سەحیحی بۆ حەدیسەکەی دەردەکەن، ئەمەش کارێکی ترسناکە، لەبەرئەوەشە کە دەبێت بەهۆی لەناوچوونی متمانەی تەدلیسکەرەکە[١٥٠].

دەگێڕنەوە لە شێخ ئەبی سەعیدی عەلائیەوە[١٥١] کە دەیفەرموو: تەدلیسی تەسویە لە گەلێك لاوە خراپیی تیادایە، بۆ نموونە:

١ـ ئەم تەدلیسە غەشکردنە و داپۆشینی راستەقینەی حەدیسێکی لاوازە و لەبەرئەوە سەر لە خەڵکی دەشێوێنت و وا دەزانن سەحیحە، کاری پێ دەکەن.

---

[١٥٠] فتح المغيث للعراقي، ل٩٨، (الشذى الفياح) ل٧٥، (فتح المغيث للسخاوي) ٢٢١/١.

[١٥١] ناوی سەلاحودینی ئەبو سەعیدی عەلائییە، یەکێکە لە پێشەوا گەورەکان و مامۆستای شێخی عێراقیش بووە، لە ساڵی (٦٩٤ك) لە دایك بووە و لە ساڵی (٧٦١ك) کۆچی دوایی کردووە، پاش کۆچەکەی عێراقی فەرمووی: حافیزی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەجێی هێشتین، بڕوانە: ذيل تذكرة الحفاظ للدمشقي ٢٨/٥، وذيليها للسيوطي ٢٣٨/٥.

٢ــ ئــەم تەدلیـسکەرە شــتێك لــە شــێخەکەیەوە دەگەیــەنێت بــە خــەڵکان کــە لێــی وەرنەگرتووە، چونکە ئەو حەدیسەکەی لێ بیستووە بەو مرۆڤە لاوازەوە و بـەبێ ئـەو لاوازە بۆی نەگێڕاوەتەوە، کەچی وا بە خەڵکان رادەگەیەنێت کـە شـێخەکەی بـەبێ لاوازەکـە بـۆی باس کردووە.

٣ـ ئەم تەدلیسکەرە کارێکی نابـەجێی لـە ریوایـەتی شـێخەکەیدا ئـەنجام داوە، کـە ئـەو فەرمانی پێ نـەداوە بیکـات، لەوانەیـە بـەم کردەوەیـەی لەکـەی تەدلیـسکردنیش بنێـت بـە شێخەکەیەوە، کاتێك کـە خـەڵکی حەدیسەکە لای کەسـانی دیکـە دەبیـنن تەماشـا دەکـەن کەسە لاوازەکەی تیادایە، بەڵام لەم ریوایەتەدا تیایدا نییە، گومان دەبەن کە شێخەکەی لای بردووە.

پاشان دەفەرموێت:

بە کورتی ئەم جۆرە ناشیرینترین جۆرەکانی تەدلیسە و ترسناکترینیشێتی[١٥٢].

---

[١٥٢] (الشذى الفياح) ل٥٧، و موسوعة علوم الحديث ٤٧٣/١.

زانایانی حەدیس خوایان لێ ڕازی بێت ئەوەندەیان دەستدرێژی و ناپاکی لە درۆزنەکان و تەدلیسکەران و دانەرانی حەدیسی دروستکراو و هەڵبەستراو بە دەم پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت) بینیوە، وایان لێ هاتووە کە سڵ لە هەموو خوێنراو و بینراوێك و بیستراوێك بکەنەوە، هەر بە وێنەی کەسێکی مارانگاز کە هەرکات هەموو خشە و تارماییەك دای دەخورپێنێ، هەروەکو لە شوێنێکی تریشدا ئاماژەمان پێ کرد، وایان لێ هاتبوو لە وریایی و هەستیارییدا کە گزیکەران و فێڵاوییەکان نەتوانن هەڵیان خەڵەتێنن و لەخشتەیان بەرن، هەرچەندە خۆدەرخەن بە تەقوا و ڕۆژوو و نوێژ و شەونوێژەوە، خوای دەکرد کاودامان کراسی قورئانی لەبەردابوایە، ئەوان هەردەبوو لێکۆڵینەوەی تەواوی خۆیان هەربکردایە، چ دەربارەی دەقی فەرموودەکە و چ دەربارەی یەکە یەکەی کەسانی زنجیرەیی سەنەدەکەی.

دەبینین جگە لەو هەموو لێکۆڵینەوەیەی کە دەکرا بەرامبەر کەسایەتی ڕیوایەتکەرەوە و ئایین و ڕەوشت و هەموو ئەو لایەنانەی کە لەمەوپێش باس کرا، دەشیان کۆڵییەوە لەو وشە و تەعبیرەی کە بەکاری هێناوە، کە هەندێ دەبوو بە تکاکار بۆیی و حەدیسەکەیان لێ وەردەگرت، بەڵام بە بەکارهێنانی هەندێکیش دەیان دایەوە بەسەری دا، تاوەکو سامانێکی زۆریان لەو تێبینی و بۆچوونانە لەلا کۆبوویەوە کە یارمەتی توێژەران و هەموو ئەوانەی کە بە دوای ڕاستییدا دەگەڕێن، دەدەن و کارئاسانییان بۆ دەکەن، کە بتوانن لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریی و تێبینییانەدا پاك و پیس و ڕاست و چەوت لێك جیابکەنەوە.

لە ڕاستییدا زانایانی حەدیس و دڵسۆزانی ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام، هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ هەست کردن بە تەدلیس و ناسینەوەی خاوەنەکانی، لێرەدا چەند ڕێباز و شێوازێکیان دۆزیوەتەوە، کە لەوانەیە توێژەر بەهۆیانەوە بیانناسێتەوە، کە بەڕێز د. عەبدوڕەزاق خەلیفە باسی ئەو ڕێبازانەی کردووە[153] و مامۆستای ڕێزدار و تێکۆشەریش عەبدولماجید ئەلغوری لەوەوە وەری گرتووە[154]، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە، وا

[153] لەو پەرتووکەیدا بە ناوی (ضوابط قبول عنعنه المدلس) ل٨١ـ ٨٢.

[154] لەو پەرتووکەیدا بە ناوی (موسوعة علوم الحديث) ب١ ل٤٥٧.

منیش لێرەدا بە پشتیوانی خوای گەورە ئاماژە دەکەم بۆ ئەو ڕێباز و تێبنییانە، بە سوودوەرگرتن لە تەقەلا و فەرموودەکانی ئەوان و ئەوەش کە کەسانی دیکە لەو بوارەدا باسیان کردووە، کە لەوانەیە گرنگترینی ئەو ڕێبازانە بۆ هەستکردن بە تەدلیس و ناسینەوەی خاوەنەکانی، ئەمانەی خوارەوە بن:

١ـ داننانی تەدلیسکەر خۆی بەوەدا کە لە حەدیسەکەیدا تەدلیسی کردووە.

ئەمەش وەکو ئەوەی کە دەیگێڕێتەوە لە ئەبی موعاویەی هوشەیمی کوڕی بەشیری قاسیمی سەلەمی، کە بە وەستای تەدلیس کردن ناسرابوو، کە ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی لێی کۆبوونەوە و وتیان دەنگ مەکەن ئێستا داوای لێ دەکەین کە حەدیسمان بۆ بگێڕێتەوە، بێگومان ئەویش تەدلسیان تێدا دەکات و ئێمەش بۆی دەسەلمێنین کە حەدیسەکانی تەدلیس کراون.

بۆ ئەم مەبەستە چوونە لای، ئەویش زۆرزان بوو، هەستی بە مەبەستەکەیان کرد و دەستی کرد بە حەدیس گێڕانەوە، هەر حەدیسێکی دەگێڕایەوە، دەیوت: (حدَّثنا حصين ومغيره عن إبراهيم) کە ئەم جۆرە تەدلیسەش زانایان پێی دەڵێن (تدليس العطف)، چونکە بەهۆی واوی عەتفەکەوە مرۆڤ وا دەزانێت کە هەردووکیان حەدیسی بۆ وتووە، لەبەرئەوەی کە زانایانی زانستی (نەحو)ی عەرەبی کۆکن لەسەر ئەوەی کە معنای واوی عەتف کۆکردنەوەی دوای خۆیەتی لەگەڵ ئەوەی پێشیوەیدا لە حوکمەکەیدا.

پاشان کە هوشەیم لێ بووەوە لە حەدیسەکانی، لێی پرسین: ئەمڕۆ هیچ تەدلیسێکم بۆ کردن؟ وتیان: نەخێر، بزەیەکی کردو وتی: تاکە یەك پیتیشم لەم حەدیسانە لە موغیرە نەبیستووە، تەنها مەبەستم ئەوەبووە کە بڵێم: حوسەین حەدیسی بۆ گێڕامەوە و موغیرە هیچم لێ نەبیستووە، واتە هەموو جارێك ڕستەی (هیچم لێ نەبیستووە) لە دوای موغیرەوە لە نیەتدا بووە و بەڵام نەمدرکاندووە[١٥٥].

دوکتۆر سوبحی ساڵح (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم ڕووداوەی هوشەیم دادەنێ بە نموونەیەك لەسەر ئەوەی کە هەندێ لە پێشەوایانی حەدیس چێژێکی دەروونییان

---

١٥٥ معرفة علوم الحديث ل١٠٥ و تدريب الراوي ل١٨٤.

**وەردەگرت لە تەدلیس کردندا، بەجۆرێك کە لە هەموو گاڵتەیەك شیرینتر بە لایانەوە، ئەوەبوو زۆر بە چاونەترساوییەوە بە خەڵکەکەیان ڕادەبوارد، پاشان کە دەیانزانی ئەم جۆرە گاڵتانەش سنوورێکی خۆی هەیە، پەشیمان دەبوونەوە و هەر خۆیان دانیان پێدا دەنا کە ئەوەی وتوویانە بیستوومانە، نەمان بیستووە[١٥٦].**

**٢ـ ئاگاداری پیاوانی حەدیس کە تەدلیسکەر بە هیچ جۆرێك حەدیسی لەو شێخە نەبیستووە کەوا دەگەیەنێ لێی بیستووە.**

**نموونەی ئەمەش وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی تیرمیزی لە یەحیای کوڕی موساوە[١٥٧]، ئەویش لە موحەممەدی کوڕی بەکرەوە[١٥٨] ئەویش لە ئیبنو جورەیجەوە، ئەویش لە عیمرانی کوڕی ئەبی ئەنەسەوە[١٥٩]، ئەویش لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسانەوە[١٦٠]، ئەویش لە ئەبی زەڕڕی غەففارییەوە[١٦١]، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) کە فەرموویەتی: (حوشتریش زەکاتی خۆی هەیە، گەنمیش زەکاتی خۆی هەیە)[*].**

---

[١٥٦] علوم الحديث، ل١٧٤.

[١٥٧] یەحیای کوڕی موسای بەڵخی سەختیانی، کەسێکی متمانەدارە، بوخاری و ئەبوداود و نەسائی و تیرمیزی ریوایەتیان لێوە کردووە، لە ساڵی (٢٤٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٢٣٩/٢٠، (الكاشف) ٢٥٦/٣ (٦٣٣٨).

[١٥٨] موحەممەدی کوڕی بەکری کوڕی عوسمانی ئەزدییە، متمانەدارە و لە ساڵی (٢٠٣ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب التهذيب) ترجمه (٥٩٦٨)، (الكاشف) ١٢/٣ (٤٧٩٦).

[١٥٩] عیمرانی کوڕی ئەبی ئەنەس قورەیشی عامری، متمانەدارە و لە ساڵی (١١٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الجرح والتعديل) ٦/ ١٦٢٨، (لسان الميزان) ٢٤٣/٣.

[١٦٠] مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسانی کوڕی حارسی کوڕی عەوف ئەبو سەعیدی حیجازی، زانایان کۆك نین لەسەر ئەوەی سەحابییە یان نا، لە ساڵی (٩٢) یان (٥٢) لە تەمەنی (٩٤) ساڵێدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الاستيعاب) ٦٤٣، (سير اعلام النبلاء) ١٧١/٤.

[١٦١] ناوی جوندوبی کوڕی جەنادەبە، ئەبو زەڕڕی غەفاری، یەکێکە لە هاوڕێ گەورەکانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ساڵی (٣٢ك) لە رەبزە کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الاستيعاب) ل١٥٢.

* ئەم حەدیسە لە موسەنیفی ئیبنو ئەبی شەیبە ٣١٣/٣، تهذيب الكمال ٣٣٨/١٨، ٣٣٣/٣، (سير اعلام النبلاء)ی زەهەبی ٦٦/٢.

پاشان تیرمیزی فەرموویەتی: لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاریم بیست کە فەرمووی: ئیبنو جورەیج هیچ بیستنێکی لە عیمرانەوە نییە و هیچی لێ نەبیستووە[١٦٢].

کەواتە ئاگاداری و شایەتی کەسانی وەکو ئەم ئیمامانەی حەدیس ئەوە دەگەیەنێت کە ئیبنو جورەیج تەدلیسی تیادا کردووە و کەسێکی لە نێوان خۆی و عیمراندا کوژاندووەتەوە.

لە راستییدا منیش لە (تهذیب التهذیب)دا ژیاننامەی ئیبنو جورەیجم خوێندەوە ڕوانیم کە شێخی ئیبنو حەجەر شەستوشەش کەسی لە شێخەکانی ناوبردووە، کەچی عیمرانی تیادا نییە، پاشان ئەویش هەمان فەرموودەکەی تیرمیزی لە بوخارییەوە گێڕاوەتەوە[١٦٣].

نموونەیەکی تریش هەر لەم جۆرە ئاگادارییەی لە پیاوانی حەدیس دەری دەبڕن کە فلآن کەس لە فلآنی بیستووە، وەکو ئەوەی کە پرسیار لە ئەبی حاتەمی رازی کرا کە ئایا سەفوانی کوڕی سولەیمی مەدەنی[١٦٤] ئەنەسی کوڕی مالیکی بینیوە؟ فەرمووی: نەخێر[١٦٥].

٣- یان بەوەدا دەزانرێت کە تەدلیس کراوەکە هەمان حەدیس بە سەنەدێکی تر لە لایەن کەسێکی دیکەوە گێڕراوەتەوە و تیایدا داننراوە بە ناوی کەسە لابراوەکەی تەدلیسکەر و شێخەکەیدا.

دیارە ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە هەر سەنەدێکی تری ئەم حەدیسە، ئەو کەسە لە نێوانی کەسە گومان لێکراوەکە و شێخەکەیدا نەبێت، مەعنای وایە کە ئەو سەنەدە تەدلیسی تیادا کراوە.

---

١٦٢ العلل الکبیر ١/١٠٠، تهذیب الکمال ٣٣٨/١٨.

١٦٣ بڕوانە (تهذیب التهذیب) ٢٤٨/٤.

١٦٤ سەفوانی کوڕی سولەیمی مەدەنی زوهری پێشەوا و خاوەنی تەقوا، وتراوە کە چل ساڵ تەنیشتی لەسەر زەوی دانەوە، لە ساڵی (٦٠) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٣٢ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال ١٠٩/٩، (الکاشف) ٣١/٢ (٢٤١٨).

١٦٥ تهذیب التهذیب ٢٤٥/٣.

عەلی کوڕی زەید کوڕی جەدعان لە (١٣١ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: الکاشف ٢٧٨/٢.

نموونەی ئەم جۆرە تەدلیسەش وەکو ئەوەی کە ئیمامی نەسائی لە ڕێگەی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلەوە[١٦٦] دەیگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی بەکرەوە[١٦٧]، لە سەعیدی کوڕی ئەبی عوروبەوە لە عەلی کوڕی زەیدەوە[١٦٨]، لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە[١٦٩]، لە ئیبنو عەباسەوە[١٧٠]، کە ئیمامی عەلی باسی کچەکەی حەمزەی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کرد، بۆ ئەو مەبەستەش کە گوایە ئەگەر پێغەمبەر بیخوازێت بۆ خۆی و لەمبارەوە هەندێ باسی جوانی و شەنگ و شۆخی کچەکەشی بۆ کرد، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموی: ئاخر ئەو کچە برازای شیریمە، چونکە من و حەمزە شیری ئافرەتێکمان خواردووە و هەر چەندە مام و برازاین، بەڵام لەم ڕێگەیەوە بوویشین بە برا، پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "ئەی گوایا تۆ نەتزانیوە کە خوای گەورە حەرامی کردووە بە هۆی شیرخواردنەوە، هەموو ئەو شتانەی کە حەرامی کردووە بە هۆی ڕەگەز و خزمایەتی‌و نەسەبەوە"؟

پاشان نەسائی دەفەرموێت: سەعیدی کوڕی عوروبە لە عەلی کوڕی زەیدی نەبیستووە، پاشان سەنەدێکی تری هەر ئەم حەدیسەی باسکردووە کە داننراوە لە نێوانیاندا بە کەسێکی تردا و فەرموویەتی: بیستوومانە لە قوتەیبەی کوڕی سەعیدەوە[١٧١] ئەویش

---

[١٦٦] مەبەستی ئیمامی بوخارییە.

[١٦٧] عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی بەکر کوڕی موحەممەدی ئەنساری مەدەنی، خاوەنی متمانەیە، لە (١٣٢ک) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: سیر اعلام النبلاء ٣١٤/٥.

[١٦٨] عەلی کوڕی زەید کوڕی جەدعان، لە (١٣١ک) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: الکاشف ٢٧٨/٢.

[١٦٩] سەعیدی کوڕی موسەیبی کوڕی حەسەنی مەخزومی، گەورەی تابیعییەکان، لە ساڵی (٩٤ک) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە (تهذیب الکمال) ٢٩٧/٧، (الکاشف) ٣٢٦/١.

[١٧٠] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئامۆزای پێغەمبەر و تەرجەمانی قورئان، لە ساڵی (٦٨ک) کۆچی دوایی کردووە، موحەممەد حەنیفە نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی: ئەمرۆ کەشتیوانی ئەم ئوممەتە ڕۆیی، بڕوانە: (الاستیعاب) ل٤٦٥.

[١٧١] قوتەیبەی کوڕی سەعیدی کوڕی جەمکی کوڕی تەریف، ئەبو ڕەجائی بەڵخی، لە ساڵی (٢٤٠ک) لە تەمەنی (٩٢)ساڵیدا مردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ٢٣٦/١٥، (الکاشف) ٣٨٣/٢ (٤٦٠٦).

بیستوویەتی لە غوندورەوە[١٧٢] ئەویش بیستوویەتی لە سەعیدەوە، ئەویش بیستوویەتی لە پیاوێکەوە، ئەویش بیستوویەتی لە عەلی کوڕی زەیدەوە، ئەویش بیستوویەتی لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە، ئەویش بیستوویەتی لە ئیبنو عەباسەوە کە دەربارەی کچەکەی حەمزە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)ی وت، حەدیسە باسکراوەکەی گێڕایەوە.

کە لێرەدا بە ئاشکرا لە سەنەدەکەی دووهەمەوە دەردەکەوێت کە سەعیدی کوڕی ئەبی عوروبە لە سەنەدەکەی یەکەمدا حەدیسەکەی تەدلیس کردووە لە پیاوێکەوە[١٧٣].

٤ـ یان بەوەدا هەست بە تەدلیسەکە دەکرێت کە ئەو حەدیسەی کە ئەو تەدلیسکەرە گێڕاویەتییەوە، هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بەس لە تاکە ڕێگایەکەوە بیستراوە، ئەو تاکە ڕێگایەش ڕێگای کەسێکە لە لاواز و متمانە پێ نەکراوەکان، کەچی کەسێك دێت و تەدلیسی تیادا دەکات و ئەو کەسە لاوازە لادەبات و سەرنگومی دەکات.

نموونەی ئەمەش وەکو ئەوە کە ئەبولفەزل عەبباسی کوڕی موحەممەدی دووری[١٧٤] دەیگێڕێتەوە لە یەحیای کوڕی موعینەوە[١٧٥]، لە موعتەمەرەوە[١٧٦] لە زوهەیرەوە ـ کە شێخێکە لە هۆزی سەلول ـ ئەویش لە یونوسەوە[١٧٧]، ئەویش لە حەسەنەوە[١٧٨] کە

---

١٧٢ موحەممەدی کوڕی جەعفەرە، بڕوانە: سیر أعلام النبلاء ٩/ ٩٨.

١٧٣ السنن الکبری ٣/٢٩٩.

١٧٤ عەباسی کوڕی موحەممەدی کوڕی حاتەمی کوڕی واقیدی دوری بەغدادی، حافیز و متمانەدارە، لە (٢٧١ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە (تهذیب الکمال) ٩/٤٧٦، (سیر اعلام النبلاء) ١٢/٥٢٢.

١٧٥ یەحیای کوڕی موعین ئەبوزەکەریای بەغدادی، بەهرەمەند و ڕێزدارە، لە ساڵی (٢٣٣ك) لە ڕێگای حەج کۆچی دوایی کردووە و لەسەر ئەو تاتە شۆرەکەی کە پێغەمبەری لەسەر شۆررابوو، شۆرییان، بڕوانە (تهذیب الکمال) ٢٠/٢١٨، (الکاشف) ١/ ٢٥٥.

١٧٦ موعتەمەری کوڕی سولەیمانی کوڕی تەرخانی تەمیمی، کەسێکی پێشەوایە، هەم لە زانستدا و هەم لە خواپەرستیدا، لە ساڵی (١٨٧ك) مردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ١٨/٢٤٢، (سیر أعلام النبلاء) ٨/٢٧٧.

١٧٧ مەبەستی یونوسی کوڕی عوبەیدە، یەکێکە لە ڕێزدارەکانی بەسرە، لە ساڵی (١٣٩ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ٢/٥٤٢، (الکاشف) ٣/٩٠ (٦٥٥٩).

١٧٨ ئەمیش حەسەنی کوڕی ئەبی حەسەنی بەسرییە، یەکێکە لە سەرۆکەکانی زانستی و خواپەرستی، لە ساڵی (١١٠ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب التهذیب) تەرجەمەی (١٢٨٣)، (الکاشف) ١/١٧٥ (١٠٢٩).

فەرمووی: (يجزی من الصوم السلام) یەحیا دەفەرموێت: ئەم شێخە سەلولییە کەسێکی بودەڵەیە هیچی تیا بەستە نییە، کەچی دەبینین لەلایەکی ترەوە هوشەیم هاتووە، تەدلیسی تیا کردووە و ئەو شێخە سەلولییەی لابردووە و راستەوخۆ لە یونوسەوە حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە، یەحیا دەفەرموێت: هەر بە هەمان شێوە حەدیسەکەی هوشەیمیش هیچی تیا بەستە نییە، چونکە وەنەبێ لە کەسێکی متمانە پێکراوەوەی گێڕابێتەوە، ئەمیش هەر لە رێگای ئەو شێخە سەلولییە لاوازەوە هاتووە کە ناوی زوهەیرە، ئەویش لە یونوسەوە، ئەم زوهەیرەش هەریەکە لە ئیبنو عودەی جورجانی[179] و ئیمامی عوقەیلی[180] و ئیمامی نەسائی[181] بە لاوازیان داناوە.

هەروەها ئیبنو حیبانیش پشتگیری ئەو زانایانە دەکات لە بۆچوونیاندا بۆ لاوازی ئەو زوهەیرە، کە دەربارەی دەفەرموێت: کەسێك بووە لەوانەی کە لە گێڕانەوەی حەدیسدا هەڵەی دەکرد، کەواتە بەس لەو حەدیسانەیدا باوەڕی پێ دەکرێت کە لە رێگای کەسانی تریشەوە هاتبێت و لەگەڵ ریوایەتەکەی ئەمدا جیاوازی نەبێت، بەڵام هەر حەدیسێك کە بەس لە رێگای ئەمەوە هاتبێت، ئەوا جێگای گومانە و لێی وەرناگیرێت[182]. ئەوەبوو کە یەحیا فەرمووی: ئەم حەدیسە بەس لە رێگای ئەمەوە هاتووە.

جا لێرەدا مرۆڤ بەزەیی بەم هوشەیمە هەناسە ساردەدا دێتەوە، کە هەرچەندە هەوڵی دا لە تەزویرەکەیدا، زانایان هیچیان بۆ نەهێشتەوە جگە لە ماندوبوون و سەرئێشان، وا باش بوو ئەو هەژارە ئەوەندە بە ساویلکانە نەیڕوانیایەتە ئەم باس و خواسە، ئەمانە نوکتە و پێکەنین نین، ئەمانە ئایین و باوەڕ و بەهەشت و دۆزەخن، هەرلەبەرئەوەشە کە ئامێرەکانی پشکنین لە خاڵی پشکنینی زانایاندا ئەوەندە بەهێز و هەستیارە هەرگیزاو هەرگیز قوشیش لێی دەرناچێت.

---

[179] الكامل ٣/٢٢٣.

[180] الضعفاء ل٣٢.

[181] الضعفاء والمتروكين ل٤٣.

[182] المجروحين، ٣١٢/١.

**٥ـ یان بەوەدا دەزانرێت کە تەدلیسکراوە کە دێن پرسیار لەو کەسە دەکەن کە حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە، ئایا تۆ ئەم حەدیسەت لەم کەسە بیستووە کە ناوت بردووە لە بەردەمی خۆتدا؟ ئەویش وەڵام بە نەخێر دەداتەوە، جا کەیفی خۆیەتی دانیش بە کەسی تردا بنێت لە نێوانیاندا یان نا[(١٨٣)].**

**نموونەی ئەمەش وەکو ئەوەی کە سولەیمانی کوڕی داودە تەیالیسی[(١٨٤)] دەیگێڕێتەوە لە شوعبەوە، لە عەمری کوڕی دینارەوە، لە جابیرەوە[(١٨٥)] کە فەرموویەتی: (ئێمە ـ گرۆهی مسوڵمانان ـ لەسەردەمی پێغەمبەردا و لەکاتێکدا کە قورئان دادەبەزی بۆ خزمەتی، عەزل[(١٨٦)] مان دەکرد).**

**جا لێرەدا شوعبە پرسیاری لە عەمر کرد ئایا تۆ خۆت ئەم حەدیسەت لە جابیر بیستووە؟ عەمریش لە وەڵامدا فەرمووی: نەخێر، کەواتە عەمر حەدیسەکەی تەدلیس کردووە[(١٨٧)].**

**شایانی باسیشە کە ئەم حەدیسە سەحیحە و هەردوو شێخی گەورە بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە بێ تەدلیس و بێ کەموکوڕی، بەڵام ریوایەتەکەی کە تەدلیسی تیادایە بەس لە لای ئیمامی ئەحمەد و نەسائییەوە هاتووە، بەم سەنەدەی کە لێرەدا باس کرا کە لە کاتێکدا ریوایەتەکەی بوخاری و موسلیم لە رێگای سوفیانی کوڕی عویەینەوە لە عەمرەوە هاتووە، بە تۆکمەیی سەنەدەکەی و بێ تەدلیس.**

---

[١٨٣] موسوعة علوم الحديث، ١/٤٦٠.

[١٨٤] سولەیمانی کوڕی داودی کوڕی جارودی تەیالیسییە، ئەیفەرموو: (٣٠ هەزار حەدیس) لە شوێنێکدا دەهێنمەوە بەبێ شانازی، لە ساڵی (٢٠٤ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: الکاشف ١/٣٤٥ (٢١٠٠)، سير أعلام النبلاء ٩/٣٧٨.

[١٨٥] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا یەکێکە لە هاوڕێکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ساڵی (٧٧ك) لە تەمەنی (٩٤) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (الاستیعاب) ل١٤٠.

[١٨٦] واتە کاتی چوونە لای خێزانەکانیان تۆوەکەیان دەڕشتە دەرەوەی رەحمی ئافرەتەکە، کە دیارە ئەم کارەیان بۆ رێگەگرتن لە منداڵ بوون ئەنجام دەدا.

[١٨٧] موسوعة علوم الحديث، ١/٤٦٠.

**دەبینین لە بوخاری دوو جار ئەم حەدیسەی دابەزاندووە کە لەهەردوو جارەکەشدا ناوی عەتای[188] خستۆتە نێوان عەمر و جابیرەوە، لە جارێکیاندا دەفەرموێت: (عەمر وتی: عەتا بۆی گێڕامەوە کە بیستوویەتی لە جابیر) واتە بە گێڕانەوەو بیستن و لە جارەکەی تریشدا دەفەرموێت: (لە عەمرەوە لە عەتاوە لە جابیرەوە) واتە بەو رێبازەی کە پێی دەوترێت عەنعەنە[189].**

**کەواتە ئیسنادەکە لەم حەدیسەدا بۆ عەمری کوڕی دینار بوو بە (ئیسنادی نازل) لەبەرئەوەی کە (عەتا) تیایدا کەوتە نێوان ئەم و جابیرەوە و بەمەش رێگاکە دوورکەوتەوە.**

**هەربۆیەش وا دەڵێین، چونکە عەمری کوڕی دینار ژمارەیەکی زۆر لە حەدیسی لە دەمی جابیر خۆی وەرگرتووە، کەواتە دەربارەی ئەو حەدیسانە، رێگاکە کورت ترەو هەربۆیەش ئیسنادەکانی ئەوان ئیسنادی عالین[190].**

---

[188] مەبەستی عەتای کوڕی ئەبی رەباحە ئەبو موحەممەدی قورەیشی، یەکێکە لە پێشەواکان، لە ساڵی (١١٥ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ١٣/٤٤، (سير أعلام النبلاء) ٥/٧٨.

[189] بڕوانە: (فتح الباري) ٦٢٠٨/١، هەردوو حەدیسی (٥٢٠٨) (٥٢٠٩).

[190] ئیسنادی عالی هەوڵدانە بۆ نزیك کەوتنەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، یان لە یەکێك لە پێشەواکانی حەدیسەوە، چونکە مەبەست لە ئیسنادی عالی ئەو حەدیسەیە کە ژمارەی کەسەکانی ناو زنجیرەی سەنەدەکەی لەگەڵ ئەوەشدا کە لە یەکترییان وەرگرتووە، کەمترە لە ژمارەی سەنەدێکی تر کە هەر هەمەمان حەدیسی پێ ریوایەت کراوە، بەڵام بە ژمارەیەکی زیاتر لە کەسانی سەنەدەکەی یەکەم.

کەواتە ئەگەر حەدیسێك بە دوو سەنەدی جیاواز بگێڕێتەوە و کەسانی ناو هەردوو سەنەدەکەش لە یەکترییان بیستووە، بەڵام یەکێکیان شەش کەسە و ئەویتریان حەوتە، ئەوا سەنەدی شەش کەسەکە بە (عالی) دادەنرێت و حەوت کەسەکەش بە (نازل)، تا ژمارەکە کەمتر بێت (عالی) بوونی سەنەدەکە بەهێزتر و بەنرختر دەکات.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە پێشەواکانی حەدیس هەمیشە شەیدای سەنەدی عالی بوون، لە پێناویدا وڵاتە و وڵات گەڕاون، چونکە تاوەکو ژمارەی کەسەکان لە سەنەددا کەمتر بێت ئەوا ئەگەری راستیی حەدیسەکە زیاتر دەبێت، لەبەرئەوەی کە هەریەکێك لە کەسەکانی لەوانەیە ببێت بە هۆی دروست بوونی هەڵەیەك لە حەدیسەکەدا، جا بەدەستی ئەنقەست بێت، یان لەبەر هەڵەکردن، کەواتە تا ژمارەی کەسەکان کەمتر بێت ئەگەری هەڵە و کەموکووڕی کەمترە.

ئیسنادی عالیش لەسەر پێنج جۆر دێت، لە هەموویان چاکتر ئەوەیانە کە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) نزیك بێت.

به جوانی دەزانم کە لێرەدا ئاماژە بۆ خاڵێکی دیکەش بکەم، ئەویش ئەوەیە کە بۆچی شوعبە پرسیاری لە عەمر کرد، ئایا تۆ خۆت حەدیسەکەت لە جابیر بیستووە؟ کە دیارە بۆیە ئەو پرسیارەی لێ کرد، چونکە وەکو وتمان، عەمر بینین و بیستنی لە جابر زۆر بووە، کە دیارە شوعبەش وەکو پێشەوایەکی گەورە و دەریایەکی بێ کەناری زانیاریی حەدیس، ئەمەی دەزانی، چونکە ئەگەر عەمر بیستنی لە جابیر نەبوایە، ئەوا هەرگیز شوعبە ئەم پرسیارەی ئاڕاستە نەدەکرد، چونکە پێویستی پێی نەدەبوو و بەبێ پرسیار کردن دەیزانی کە تەدلیس کراوە.

٦ـ یان بەوەدا دەزانرێت کە تەدلیس کراوە، پرسیار لە کەسەکە دەکرێت، کە ئایا تۆ خۆت ئەم حەدیسەت لەو شێخە بیستووە کە لە بەردەمتدا ناوت هێناوە؟ ئەویش لە وەڵامدا ناوی کەسێك لە نێوانیاندا دەهێنێت و دان دەنێت بە تەدلیسەکەدا.

نموونەی ئەمەش وەکو ئەوەی کە لە تەدلیسی ئیسناددا باسمان کرد، کە سوفیانی کوڕی عویەینە حەدیسی دەگێڕایەوە و دەیفەرموو: زوهری دەفەرموێت: پێیان وت زوهری خۆی حەدیسەکەی بۆ گێڕایتەوە؟ بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: زوهری دەفەرموێت، لێیان پرسییەوە خۆت لە زوهریت بیستووە؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، خۆم لە زوهریم نەبیستووە و لەوەیشم نەبیستووە کە لە زوهری بیستووە، بەڵکو عەبدوڕەزاق بۆی گێڕاومەتەوەو ئەویش لە موعەمەرەوە و ئەویش لە زوهریی بیستووە[١٩١].

ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێت، سوفیانی کوڕی عویەینە تەدلیسی دەرکرد و ئەیوت: (عن الزهري)، کاتێك لێیان دەپرسی: کێی تر لە نێوان تۆ و زوهریدا؟ ئەویش لەوەڵامدا ئەیوت: باشە ئێوە بە زوهری قەناعەت ناکەن و دڵتان ئاو ناخواتەوە؟ ئەوانیش دەیانوت: بەڵێ دەیکەین، بەڵام حەزدەکەین بزانین کێ لەوی بیستووە، هەر کۆڵیان لێ

---

دەگێڕنەوە کە لە کاتی سەرەمەرگیدا لە یەحیای کوڕی موعین-یان پرسی: حەز لە چی دەکەی؟ ئەویش فەرمووی: (ماڵێکی خاڵیو ئیسنادێکی عالی)، بەندە، نووسەری ئەم دێرانە توێژینەوەیەکی لە ئیسنادی عالی و نازل دا بە زمانی عەرەبی نووسیوە. بڕوانە: (التقييد والايضاح) ٧٥٢/١، و (علوم الحديث) ٢٣٦، و (موسوعة علوم الحديث) ٢٥٣/١.

[١٩١] التقييد والايضاح ٤٥٠/١، فتح الباقي ١٦٥.

نەئەدا، ئەویش لێیان پەست دەبوو بە دوعاکردنێکی شەڕەوە ئەیوت: مەعمەر، خوا پیت و فەڕتان نەداتێ[١٩٢].

٧ـ یان بەوەدا دەزانرێت کە تەدلیس کراوە کە شێخی ئەو کەسەی تەدلیسەکەی کردووە دان ئەنێت بەوەدا کە ئەو کەسە حەدیسەکەی لەو بیستووە و پاشان تەدلیسی تیادا کردووەو ناوی ئەوی لە زنجیرەی سەنەدەکەدا سڕیوەتەوە.

نموونەی ئەمەش وەکو ئەوەی کە خەتیبی بەغدادی لە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکەوە[١٩٣] دەیگێڕێتەوە کە فەرمووی: بە شورەیکی کوڕی عەبدوڵڵای نەخەعیم[١٩٤] وت: ئایا تۆ ئەبوسەعدی بەقاڵ دەناسیت؟ ئەویش بە تەوسەوە وەڵامی دامەوە و وتی: بەڵێ، ئەرێ وەڵڵا ئەیناسم (ئیسنادەکانی عالییە) [١٩٥] من حەدیسێکم بۆ گێڕاوەتەوە لە عەبدولکەریمی جەزەرییەوە[١٩٦]، ئەویش لە زیادی کوڕی ئەبی مەریەمەوە[١٩٧]، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەعقەلەوە[١٩٨]، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە[١٩٩] کە فەرمووی: پێغەمبەر

---

[١٩٢] التمهید ١/ ٢٩ـ ٣٠.

[١٩٣] عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك کوڕی وازیح، یەکێکە لە پایە بڵندەکانی حەدیس، لە ساڵی (١٨١ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ٤٦٦/١٠، (الکاشف) ١١٩/٢ (٢٩٧١).

[١٩٤] شورەیکی کوڕی عەبدوڵڵای نەخەعی، یەکێکە لە متمانەدار و پێشەواکان، لە ساڵی (١٧٧ك) لە تەمەنی (٨٢) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تذکرة الحفاظ) ١٧٠/١، (الجرح والتعدیل) ٤/ ١٦٢.

[١٩٥] لەپەراوێزێکدا لەمەوپێش ئیسنادی عالیو نازل روونکراوەتەوە، تکایە با لەوێدا تەماشا بکرێت.

[١٩٦] عەبدولکەریمی کوڕی مالیکی ئەبو سەعیدی جەزەری، حافیزە و حەدیسی زۆری گێڕاوەتەوە، لە ساڵی (١٢٧ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: سیر اعلام النبلاء ٨٠/٦، (الکاشف) ١٩٩/٢ (٣٤٦٦).

[١٩٧] زیادی کوڕی ئەبی مەریەمی جەزەری، کەسێکی متمانەدارە، بڕوانە: (تهذیب الکمال) ٤٠٥/٦، (الکاشف) ٢٨٧/١ (١٧٢٣).

[١٩٨] عەبدوڵڵای کوڕی مەعقەلی کوڕی موقرینی موزنی، ئەبو وەلیدی کوفی، کەسێکی متمانەدارە. بڕوانە: تهذیب الکمال ٥٥٩/١٠ (٣٥٦٩) و سیر اعلام النبلاء ٢٠٦/٤.

[١٩٩] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کوڕی غافیلی هەزەلی، هاوڕێی شیرینی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ساڵی (٣٢ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: سیر اعلام النبلاء ٤٦١/١، (الکاشف) ١٢٥/٢ (٣٠١٠).

(درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (الندم التوبة)[٢٠٠] کە بەڕێزی هاتووە منیش و عەبدولکەریمیش و زیادیشی لە سەنەدەکە لابردووە و بەسەر هەرسێکماندا قەڵەمبازی داوە و راستەوخۆ حەدیسەکەی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەقەلەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت).

کە دیارە لێرەدا بەم روونکردنەوەیەی شورەیکدا زانرا، کە ئەبو سەعد تەدلیسی لە حەدیسەکەدا کردووە.

٨ـ یان بەوەدا دەزانرێت کە تەدلیسی کردووە کە یەکێك لە ئیمام و شارەزایانی حەدیس روونی دەکاتەوە، ئەو کەسەی حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە، ئەو حەدیسەی لەو شێخەی بەردەمی خۆی نەبیستووە کە ناوی بردووە[٢٠١]. ئەویش وەکو ئەوەی کە پێشەوایەکی شارەزا، دان بە ژمارەی ئەو حەدیسانەدا بنێت، کە تەدلیسکەر لە کەسێك لەو کەسانەی بیستووە، کە تەدلیسی لە حەدیسەکانیاندا کردووە[٢٠٢].

لە راستییدا کاتێك کە ژیاننامەی پیاوانی حەدیس دەخوێنیتەوە لەو پەرتووکانەدا کە بۆ ئەو مەبەستە دیاری کراون، وەکو:

(الجرح والتعديل)ی عەبدوڕەحمانی ڕازی و (تهذيب الكمال)ی مززی و (تهذيب التهذيب)ی عەسقەلانی و هاووێنەکانیان، دەبینیت کە هەندێ جار لە هەندێ تەرجەمەدا دانەر دەفەرموێت ئەم کەسە ریوایەتی لە فلان کەسەوە تەنها چوار حەدیسە، یان فلان کەس جگە لە سێ حەدیس هیچی تری لە فلان کەسەوە نەبیستووە، کەواتە ئەگەر ئەم وتی سێ حەدیس و ئەو شەشی لێوەگێڕابووە، مانای وایە کە لە سیانیاندا تەدلیسی کردووە.

---

٢٠٠ رواه الامام احمد في مسنده ٣٧٦/١.

٢٠١ موسوعة علوم الحديث، ٤٦١/١.

٢٠٢ الكفاية ل٥١٤.

**نموونەی ئەمەش وەکو ئـەوەی کـە ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لـە شـوعبەوە دەگێڕێتـەوە کـە دەیفەرموو: "ئەبو ئیسحاقی هەمەدانی[٢٠٣] جگە لە چـوار حـەدیس هیـچی تـری لـە حارسـی ئەعوەرەوە[٢٠٤] نەبیستووە"[٢٠٥].**

**بەڵام ئەوەی کە لێرەدا کێشەکە بنـەبڕ دەکـات و دڵنیـا دەبـین لـە باسـەکە و کەسـەکە، ئەوەیە کە ئەو ئیمامە ئەوەندە زەحمەتیش بکێـشێت وەکـو ژمارەکـەی دەستنیـشان کـرد، حەدیسەکانیش روون بکاتەوە و دیارییان بکات کە کامانەن، وەکو ئەوەی کـە شـێخی ئیبنـو حەجەر (خوای لیّ رازی بێـت) دەیگێڕێتـەوە لـە ئیمـامی ئەحمـەد و کەسـانی تریـشەوە کـە فەرموویانە: حەکەم[٢٠٦] جگە لە پێنج حەدیس هیچی تری لە میقسەم[٢٠٧] نەبیستووە.**

**یەحیای کوڕی قەتتانیش هەر پێنجیانی دەستنیشان کردووە، کە ئەمانەی خوارەوەن:**

**حەدیسی وەتر، حەدیسی قونووت ـ حەدیسی عەزمەت و تەڵاق، حەدیسی جەزائو سـەید ـ حەدیسی ئـەوەی کـە پیـاو بـچێتە لای ژنەکـەی لـە کـاتی حـەیزدا، کـە ئـەم قـسەیە ئـەبی خەیپەمـە لـە مێژووەکەیـدا گێراویەتییـەوە لـە عـەلی کـوڕی مەدینییـەوە، لـە یـەحیای قەتتانەوە[٢٠٨].**

**نموونەیەکی تری ئەم جۆرە ئاگادارییە وەکو ئەوەی کە ئیمـامی بوخـاری (رەزای خـوای لیّ بێت) دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی زالیمی تەمیمی دەفـەرموێت: لـە دوو حـەدیس زیـاتری**

---

[٢٠٣] عەمری کوڕی عەبدوڵڵا ئەبو ئیسحاقی هەمەدانی، شێخ و عابید و زاهید، لە ساڵی (١٢٧ك) لە تەمەنی (٩٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٢٦٥/١٤ (٤٩٨٤)، (سير أعلام النبلاء) ٣٩٢/٥.

[٢٠٤] حاریسی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی کەعب ئەبو زوهەیری هەمەدانی ئەعوەر، هەندێ گلەیی لیّ دەکەن، لە ساڵی (٦٥ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٣٩/٤ (١٠٠٨) و (تهذيب التهذيب) ١١٧/٢ (١٠٧٦).

[٢٠٥] (الجرح والتعديل) ١٤٨/١.

[٢٠٦] حەکەمی کوڕی عوتەیبە، ئەبو موحەممەدی کیندی، خاوەنی پلەو متمانەیە، لە ساڵی (١١٣ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (تهذيب الكمال) ٧/ ١١٤، (تقريب التهذيب) ١٩٢/١.

[٢٠٧] میقسەمی کوڕی بوجرە، ئەبو ئیبنی نەجدە، کەسێکی متمانەدارە، لە ساڵی (١٠١ك) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (تهذيب الكمال) ١٨/ ٣٥٤، (الكاشف) ١٥٥/٣ (٥٦٩٥).

[٢٠٨] (تهذيب التهذيب) ١٧١/٢.

**ریوایەت نەکردووە، ئەوانیش حەدیسی (عشرة في الجنة)[209] وە حەدیسی (بحسب أصحابي القتلُ)[210].**

209 بڕوانە بۆ ئەم حەدیسە لەلای تیرمیزی (٣٧٥٧)، ئەبوداود (٤٦٤٨) و نەسائی (١٠١) و ئیبنو ماجە (١٣٤).

210 (تهذيب التهذيب) ٢/ ١٢٥.

ئەم نووسراوە هەوڵێکە لە پێناوی روونکردنەوەی یەکێك لـە زانـستیەکانی حـەدیش، کـە ئەویش (تەدلیسە لە لای زانایان)، باسەکەش دابەش کراوە بەسەر پێشەکییەك و سێ بـەش و کۆتاییەکدا.

لە پێشەکییەکەدا ئاماژە بۆ چەند لایەنێك کراوە، وەکو ئەو مـوژدە شـیرینەی کـە خـوای مەزن بـە گـەلی ئیـسلامی فـەرمووە کـە ترسـی فـەوتان و گـۆڕانی قورئانـە پیرۆزەکـەیانیان نەبێت، چونکە خوا خۆی ناردوویەتی و هـەر ئـەویش دەیپـارێزێ، کـە ئەمـەش بێگومـان لـە هـەمان کاتـدا موژدەشـە بـۆ پارێزگـاری کردنـی فـەرموودەکانی پێغەمبـەرە نازدارەکەشـی (درووودی خوای لەسەر بێت)، چـونکە تێگەیـشتن لـە مەبەسـت و باسـەکان و ئەحکامـەکانی قورئـان، لـە زۆربـەی شـوێنەکانیدا رادەوەسـتێت لەسـەر روونکردنـەوەی ئـەو حەدیـسانە، هەروەکو خوای گەورە خۆی فەرموویەتی: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ).

هەر بۆیەش خوای گەورە لە هەموو بارودۆخێکدا کۆمـەڵێکی هەڵبـژاردەی لـە دڵسۆزانی ئیسلام کردووە بە سەربازی پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر و پاراستنیان لە فـەوتانن و دەسـتدرێژی کردنـی ناپاکـان بۆیـان و شـێواندنیان و لـەناوبردنیان، کـە ئـەم کۆمەڵـە بـۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرنگەی خۆیان دەیان زانستی پێوەر و بنەما و یاسـایان داهێنـا، کـە سەرەنجی دۆستان و دوژمنانیان راکێشاوە، هەروەها دەربارەی ئەو کەسەی کە دەم دەبات بـۆ حـەدیس و دەیانگێڕێتـەوە، کۆمـەڵێك داواکـاریی ورد و مـەرجی کاریگـەریان دانـاوە کـە هەرکەسـێکی بەختـەوەر توانـای بـەدەس هێنانیـانی هـەبێت، ئـەوە بێگومـان چـاکترین و پاکترینی هەموو کۆمەڵ دەبێت و ئەو کاتەش جێگای خۆی دەبێـت کـە شـەرەڤ گێڕانـەوەی ئەو فەرموودانەی پێ ببەخشرێت.

ئەو داواکارییانە و بنەمایانە و مەرجانە، تاڕادەیەك بە درێژی لەو پێـشەکییەدا تیـشکیان خراوەتە سەر و روونکراونەتەوە.

لە بەشی یەکـەمی نووسـینەکەدا، کـە تـەرخانکراوە بـۆ (مانـای تـەدلیس و جۆرەکـان)، مەبەست لە وشـەی (تـەدلیس) روون کراوەتـەوە کـە لـە بنەڕەتـدا بـە مانـای تێکـەڵ بـوونی رووناکی بـە تـاریکی دێـت، پاشـان گوێزراوەتـەوە بـۆ رووکەشـکردنی شـت و پاشـانیش بـۆ شاردنەوەی عەیبی عەیبدار لە کاتی مامەڵەکردندا، هەر بۆ ئەم مەبەستەش زانایانی حەدیس

بەکاریان هێناوە بۆ شاردنەوەی ئەو عەیبانەی کە لە حەدیسدا دەبن و بەهۆیانەوە زانایان ئەو حەدیسانە وەرناگرن و کاری پێ ناکەن، لەبەرئەوە کەسێکی گزیکەری فێڵباز بە قسە گۆڕین و فێڵێکی وشەیی عەیبەکە دادەپۆشێت و خەڵکەکە چەواشە دەکات، تاوەکو عەیبەکە نەبینن و حەدیسەکەی لێ وەرگرن.

لەبەرئەوەش کە تەدلیس چەند جۆرێکە و پێناسەی هەرجۆرەش لەگەڵ جۆرەکانی تردا جیاوازە، وا بە باشزانراوە کە هەر جۆرە بە جیا پێناسە بکرێت، کە ئەمەش ناچاری کردین بۆ ئاماژەکردن بۆ ئەو جیاوازییەی لە نێوان زانایانی حەدیسدا هەیە، دەربارەی جۆرەکانی تەدلیس.

پێشەوای گەورەی حەدیس و زانانی بلندی کورد، ئیبنو سەلاحی شارەزووری و هەندێك لە هاوبیرانی، تەدلیسیان بە دوو جۆر داناوە، ئەوانیش (تەدلیسی ئیسناد)و(تەدلیسی شیوخ)، لە کاتێکدا کە کۆمەڵێکی دیکە بە سەرکردایەتی شێخی گەورەمان حافیزی عێراقی تەدلیس بە سێ جۆر دەزانن، یەکەم و دووەم ئەوانە بوون کە باسکران و جۆری سێهەمیش ناویان ناوە (تەدلیسی تەسویە).

ئەوی راستی بێت ئەم جیاوازییەش لە نێوانیاندا بەس بە ناوە، ئەگینا گرووپی یەکەمیش باوەڕیان بەم جۆری سێهەمە هەیە، تەنها ئەوەیە کە ئەوان بە وێنەیەکی جۆری یەکەمی دەبینن، نەك بە جۆرێکی سەربەخۆ، لەم شوێنەشدا ئاماژە بۆ روونکردنەوەیەکی هێمنانەی بە ویژدانانەی شێخی عەسقەلانی کراوە، دەربارەی پارێزگاری لە ئیبنو سەلاح و وەڵامدانەوەی عێراقی.

پاشان لەم بەشەدا باسی جۆرەکانی کراوە و وتراوە:

جۆری یەکەم کە (تەدلیسی ئیسنادە) لە چەند وێنەیەکدا خۆی دەبینێتەوە، وەکو ئەوەی کە تەدلیسکەر فەرموودەکە دەگێڕێتەوە لە شێخێکەوە کە بینیویەتی و فەرموودەشی لێ بیستووە، بەڵام ئەم فەرموودەیەی ئێرەی لێ نەبیستووە، یان بیگێڕێتەوە لە شێخێکەوە کە هاوچەرخی بووە و بەڵام هیچی لێ نەبیستووە، بەڵام وا باسەکە بکات، کە وا بزانرێت لە خۆی بیستووە، یان بیگێڕێتەوە لە شێخێکەوە کە هاوچەرخیشی نەبووە و نەشی بینیوە، بەڵام وا باسەکە بکات کە خەڵکان گومان ببەن، کە لە خۆی بیستووە یان

بیگرێتەوە لە پەڕەو نووسراوی کەسێکەوە کە هاوچەرخی خۆی بووە دیبێتی یان نەی دیبێ، بەڵام خەڵکان وابزانن کە لە دەمی خۆی بیستووە، وە بۆ هەر یەکێك لەم وێنانە نموونەی واقیعی لەو رووداوانەی کە زانایان لە تەدلیسکەرانیان بینیوە، هێنراوەتەوە و شایانی باسیشە کە لەناو بەناوی ئەم وێنانەدا چەند ئاماژەیەك بۆ هەندێ لایەن بەرچاودەکەوێت، کە ناکرێت پشتگوێ بخرێن وەکو ئەوەی کە ئەو وشەیەی تەدلیسکەر بەکاری دەهێنێت نابێت بە زەقیی بیستن بگەیەنێت، وەکو (سمعت) یان (حدَّثني) بەڵکو وا گومان پەیدا بکات کە بیستوویەتی وەکو: (عن فلان) یان (قال فلان).

وەکو ئەوەی کە پێویستە ئەو کەسەی کە تەدلیس لە شێخێکەدا دەکات، حەدیسی تری جگە لەمەی لێ بیستبێت و بووبێت بە شێخ و مامۆستای، چونکە ئەمەیە بنەمای چەواشەکردنی خەڵکەکە، ئەگینا ئەگەر ناوی کەسێکی هێنا کە هیچی لێ نەبیستووە، ئەوە بە ڕای زۆربەی زانایان ئیرساله نەك تەدلیس.

دوای ئەوەی باسی جۆری دووەم کە تەدلیسی شیوخە هاتۆتە باسەوە، کە ئەویش سڕینەوەی ناوی کەسی تیا نییە، بەڵکو تەمومژاوی کردنی ناوی شێخەکەیە، بەناوبردنی بەناوێکی نەناسراو و نەزانراوو، بۆ روونکردنەوەی ئەم جۆرەش گەلێ نموونەی واقیعی لە دەسکردی تەدلیسکەران هێنراوەتەوە.

هەر لێرەشدا ئاماژە بۆ ئەو گلەییە کراوە کە ئیبنو سەلاح و گەلێ لە زاناکانی دوای خۆی لە خەتیبی بەغدادییان کردووە، کە گوایە زۆری حەز لەم جۆرە تەدلیسە بووە و هێنانەوەی نموونە لە پەرتووکەکانی، لەگەڵ دابەزاندنی رایەکی عەسقەلانی و پارێزگارییەکی جوانی لە خەتیب.

دوای ئەم باسانە قسە لەسەر جۆری سێهەم (تەدلیسی تەسویە) کراوە، کە حافیزی عێراقی زۆر گرنگی پێداوەو بە خراپترینی هەموو جۆرەکانی داناوە، کە شێوەی ئەویش ئەوەیە کە تەدلیسکەر حەدیسێکی لە شێخێکی متمانەپێکراوو بیستووە، ئەو شێخەش لە شێخێکی لاواز و ئەو لاوازەش لە شێخێکی متمانە پێکراو، ئینجا تەدلیسکەر دێنێ شێخەکەی خۆی دەهێڵێتەوە و شێخە لاوازەکەی شێخەکەی لادەبات، بەمە زنجیرەکە ساف و لووس دەکات و هەموویان دەبن بە متمانەدار، ترسناکیی ئەم جۆرە تەدلیسەش لە چەند

روویەکەوەیە، وەکو ئەوەی کە هـەموو زنجیرەکـە بـووە بـە متمانـەدار و ئـەو شـێخەی دوای تەدلیسکەریش دەتوانێ لـەم جـۆرەدا وشـەی گەیەنـەری بیـستن، وەکـو (سمعتُ) (حـدثنا) بەکاربهێنێت، لەبەرئەمانە هەرگیز رێی تێ ناچێت تەدلیس کرابێت.

هەر لێرەشدا درکێنـراوە کـە یەکـەم کەسـێك ئـەم نـاوەی لێنـاوە ئـەبو حەسـەنی کـوڕی قەتتان بووە و لە پێش ئەودا پێیان وتووە تەدلیس تەجوید، لەو کەسانەی کە بە زۆری ئـەم تەدلیـسەیان کـردووە بەقییـەی کـوڕی وەلیـد و وەلیـدی کـوڕی موسـلیم بـوون کـە لێـرەدا نموونەمان لە لایەنی هەردووکیانەوە هێناوەتەوە.

لە بەشی دووەمدا کە تەرخان کراوە بۆ باسی حوکمی هەریەکە لە جۆرەکانی تـەدلیس و ریوایەتی تەدلیسکەر، وتراوە: کـە هەرسـێ جۆرەکـانی تـەدلیس بـەلای زانایانـەوە خـراپ و ناپەسەندن، بەڵام لەوانەیە کە خراپیی هەندێکیان بەلایانەوە زیاتر بێت لە هەندێك.

دەربارەی تەدلیسی ئیسناد ئیبنو سـەلاح دەفـەرموێت: کـارێکی قێزەونـە، تەنانـەت لـە پێشەوایەکی وەکو شوعبە بەلایەوە لە زیناکردن پیستر بووە، بـەڵام لـە هـەمووی کارەسـات تر ئەوەیە کە هەندێ لە زانایان ئەم تەدلیسە بـە بـە تـەجریح دادەنـێن، کەواتـە بـەلای ئـەم کۆمەڵەوە هەرکەسێك تاکە جارێکیش ئەم تەدلیسەی لـێ بینـرا ئـیتر کەسـایەتی لـە دەسـت دەدات و هیچ ریوایەتێکی دوای ئەوە لێ وەرناگیرێت، کەیفی خۆیەتی دووپاتی کردەوە یـان نا، یان دان بنێت بە بیستندا یان نا، تەدلیسی لە متمانەدار کردبێت یان بێ متمانە، کە ئـەم رایە شێخی ئیبنـو سـەلاح لـە زاناکانـەوە گێڕاویەتییـەوە و شـێخی عێـراقیش پـشتگیری لـێ کردووە و فەرموویەتی کە خەتیبی بەغدادیش لە (الکفایة)دا ئەم ڕایەی گێڕاوەتەوە.

بەڵام هەر عێراقـی خـۆی ڕایـەکی تـری لـە ئـەبی حەسـنی قەتتانـەوە گوێزاوەتـەوە، کـە فەرموویەتی: ئەو کەسەی متمانەدارە دوای تەدلیسەکەش متمانەکەی هەر دەمێنێـت، بـەڵام بەس بەرامبەر ئەوانەی کە تیایـدا دەڵـێ بیـستوومە، ئـەم جـۆرەی لـێ وەردەگیرێـت، بـەڵام لەوانەی دانی تیایاندا نەناوە بە بیستندا، متمانەی پێ ناکرێت و لێی وەرناگیرێت.

پاشان ئیبنو سەلاح رایەکی تری دەربڕیوە و فەرمویـەتی: وا چـاکە جیـاوازی بکـەین لـە نێوان ئەو ریوایەتەی کە تەدلیسکەر دانی تیادا ناوە بە بیستندا و ئەم جۆرەی لێ وەربگرین و ئەوەی کە دانی تیادا نـەناوە بـەڵکو گومـانی بیـستنی لـێ دەکرێـت، ئەمـەیانی بدەینـەوە

بەسەردا و حوکمی حەدیسی مورسەلی بدەینێ، بۆ پشتگیری راکەشی دەفەرمویت: بەڵگەشمان لەسەر دروستی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان وەکو بوخاری و موسلیم و ئەوانی دیکەیشیان، ژمارەیەکی زۆری لە حەدیسی ئەم جۆرە کەسانە وەکو قەتادە و ئەعمەش و هەردوو سوفیان و کەسانی دیکەشی تێدایە، کە لە چەندان حەدیسی دیکەیاندا تەدلیسیان کردووەو بەڵام چونکە لەو حەدیسانەیاندا دانیان بە بیستندا ناوە، ئەوانەیان لێ وەرگیراوە.

ئەم جیاوازییەی ئیبنو سەلاح کردی کارێکی پەسەندە، بەڵام گرفتێکی تێدایە، ئەویش لەوەدا کە زانایان هەرچەندە لەگەڵیدا کۆکن دەربارەی ئەم حەدیسەی کە تەدلیسکەر دانی ناوە بە بیستن تیایدا، بەڵام لەگەڵیدا نین دەربارەی ئەوانەی کە باسی بیستنیان نەکراوە، ئەو فەرمووی ئەم جۆرە حوکمی حەدیسی مورسەلی دەدرێتێ، کەچی دەبینین زۆر لەوانەی کە مورسەل وەردەگرن، حەدیسی تەدلیس کراو وەرناگرن.

لەبەرئەوەی کە لێرەدا باسی مورسەل هاتە پێشەوە و هەندێك تەدلیس کراویان وەکو مورسەل تەماشا کرد، وا بەباش دەزانم کە تیشکێك بهاوینە سەر ئەم جۆرە حەدیسە و رای زانایانی بەرامبەر روون بکەینەوە.

رای جیاجیا هەیە بەرامبەر حەدیسی مورسەل، بەڵام بەهێزترینیان ئەوەیە کە ئەو ناوە بە حەدیسێك دەوترێت کە تابعییەك راستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لەسەر بێت) بگێڕێتەوە و بفەرموێت (قال رسول الله ﷺ) ناوی ئەو سەحابییە نەبات کە لە پێغەمبەری بیستووە.

ئینجا زانایانی حەدیس و ئوسول و فیقهی ئیسلامی دەربارەی مورسەل، بوون بە دوو کۆمەڵەوە:

**کۆمەڵەی یەکەم:** حەدیسی مورسەل بە بەڵگە دانانێن و ئەحکامی پێ ناسەلمێنن، ئەم کۆمەڵە لەسەر راکەی خۆیان چەند بەڵگەیەکی بەهێزیان هێناتەوە و کە بە روونی ئاماژەمان پێ کردوون.

**کۆمەڵی دووهەم:** باوەڕیان وایە کە حەدیسی مورسەل بەڵگەیە، بەڵکو هەندێکیان زیادەڕەوشیان کردووەو دەڵێن کە گوایا مورسەل لە مەرفوعیش باشترە.

ئەم دوو کۆمەڵەش دەربارەی حەدیسی تەدلیس کراو رایان بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

کۆمەڵی یەکەم: هەروەکو باوەڕیان بە مورسەل نییە، هەروەها باوەڕیشیان بە تەدلیس کراو نییە.

بەڵام کۆمەڵی دووەم: کە باوەڕیان بە مورسەل هەبوو، دەربارەی تەدلیس کراو بوون بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەمیان:** هەروەکو باوەڕیان بە مورسەل هەبوو هەروەها باوەڕیشیان بە تەدلیس کراو هەیە.

**بەشی دووهەمیان:** باوەڕیان بە مورسەل هەبوو، بەڵام باوەڕیان بە تەدلیس کراو نییە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە تەدلیس لە بنەڕەتا بەندە لەسەر ساختە و گزی کردن و چاوبەست کردن لە خەڵکان و ئایین شێواندن، کە ئەم خراپەکارییانە لە ئیرسالدا بەدی ناکرێن.

بە دوای ئەم باسانەدا، روونکردنەوەی ئەو هۆکارانە دێنە پێشەوە کە دەبن بە هۆی تەدلیسی شیوخ و نەهێشتنی شەفاف لەناوەکەیدا، کە کۆمەڵێك هۆکاری کاریگەر لەم لایەنە باسکراون.

دەربارەی حوکمی ئەم جۆرە تەدلیسەش زانایان هەر توندوتیژن و فەرموویانە ئەگەر لەبەرئەوە ناوی شێخەکەی تەمومژاوی کرد کە خۆیشی و هەموو خەڵکان، یان بەس خەڵکان بە لاوازی دەزانن، ئەوا لەم دوو کاتەدا حەدیسی لێ وەرناگیرێت، دەربارەی هۆکارەکانی تریش پێویستە حەدیسەکە رابگرین تاوەکو بە تەواوی لێکۆڵینەوە دەربارەی شێخەکەی دەکەین.

هەروەها تەدلیسی تەسویەش زۆر بە توندی دژایەتی کراوە و بەلایانەوە بە خراپترینی هەموو جۆرەکان دادەنرێت چونکە وەکو باسکرا چەند هۆکارێکی تیادایە کە دەرفەتی هەست کردن بە تەدلیسەکە لەناو دەبەن.

لە بەشی سێهەمدا کە تایبەتە بە باسی رێگاکانی هەست کردن بە تەدلیس کردن، رۆڵی زانایان و هەوڵ و تەقەلایان لەو بوارەدا نرخێنراوە و ئاماژە بۆ کۆمەڵێك لەو رێبازانە کراوە کە یارمەتیدەدەن بۆ هەست کردن بە تەدلیس و دۆزینەوەی، یەکێك لەو رێگایانە ئەوەیە کە ئەو کەسە خۆی دان بنێت بەوەدا کە تەدلیسی کردووە.

یەکێکی دیکەش ئەوەیە کە شارەزایانی حەدیس و پیاوانی، رایبگەیەنن کە تەدلیسکەر هیچ بیستنێکی نییە لەو شێخەوە کە ئێستا وا دەردەخات کە حەدیسی لێ بیستووە، هەروەها شەش رێبازی تریش لەو رێبازە یاریدەدەرانە کە زانایان بە پشکنین و بە بەدواداچوون و بیرکردنەوە، هەستیان پێ کردوون و تۆماریان کردوون، لەگەڵ هێنانەوەی نموونەی واقعیش بۆ رێبازەکان.

هذا العمل المتواضع محاولة تروم القاء الضوء على جانبٍ من جوانب علوم الحديث، وهو (التدليس عند المحدثين) من خلال مقدمة وثلاثة أقسام وخاتمة.

أُشير في المقدمة الى أمور يُستحسنُ أن يطَّلع عليها، مثل الوعد الذي أبرمه سبحانه وتعالى على نفسه بأن يحفظ هذا القرآن الذي أنزله نوراً للبشرية ودستوراً لحياتهم، فلا شكَّ أنَّه يتضمن بشارة بحفظ أحاديث الرسول ﷺ أيضاً من كل دس أو تحريف أو تزوير، لأنَّ فهم القرآن الكريم وتنفيذ كثير من أوامره ونواهيه وأحكامه ودساتيره يتوقف على بيان من الرسول ﷺ، فهو الذي بيَّن للناس بأقواله وأفعاله وتقريراته كلَّ هذه الأمور، لأنَّ ذلك كان ضمن واجباته ﷺ على ما قرره سبحانه وتعالى بقوله الكريم: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) (النحل: ٤٤).

وتحقيقاً لذلك فقد هيأ الله سبحانه وتعالى في كل فترةٍ من فترات تأريخنا صفوة مختارة من علماء هذه الأمه للقيام بهذه المهمة العظيمة، فكانوا بحق قادة الإهتداء، وسادة المهتدين، اختارهم الله سبحانه وتعالى لحماية أحاديث نبيه ﷺ من كلّ سوءٍ يراد به من أيادى متطاولة، من أعداء الدين والماكرين والحاقدين.

أدرك هؤلاء الجنود بأنهم لا يتمكنون من أداء مهمتهم إلا بعدة تساعدهم وتسهل لهم أمرهم، لذلك قاموا بإختراع عشرات من العلوم الحديثية والقواعد النقدية، بغية تمييز المتون الصحيحة من باطلها، والاسانيد المستقيمة من سقيمها حتى أعجبت كل هذه القواعد والعلوم الأعداء قبل الأصدقاء، وكذلك وضعوا شروطاً دقيقة وفعَّاله لرواة الاحاديث وحملة الآثار، يكون من يفوز بحيازتها بلا شك من خيرة الرجال وأفضلها، وعند ذلك يكونُ أهلاً لكي يناط إليه شرف سماع الحديث وروايته، وقد أشير في هذه المقدمة الى عدد من هذه الشروط والأسس بشيء من التفصيل.

وفي القسم الأول من هذا العمل والذي خصِّص لبيان معنى التدليس وأنواعه، وضِّح معنى التدليس وأنواعه، وُضِّحَ معنى التدليس الذي كان يعني في البداية اختلاط النور بالظلمة، ثم نُقل الى التموية ثم بعد ذلك الى كتمان العيب في السلعة التي يراد التداول بها، ومن ثم نقله المحدثون الى اخفاء عيب في اسناد حديثٍ ربَّما يتسبب في ردّ الحديث ورفضه من قبل العُلماء ولذلك يقوم واحد من المحتالين ـ غالباً ـ بتضليل كلاميّ، وخداع لفظي يساعدُ على إخفاء عيب الحديث، حتى لا يشعرَ به منْ يراه فينخدع ويقبله.

وبما أنَّ التدليس على أنواع مختلفةٍ وقد يكون تعريف نوع منه مختلفاً مع تعريف نوعٍ آخر، استحسنتُ أن يُعرف كلُ نوعٍ منه على حدةٍ وهذا بدوره دفعني الى التطرق الى اختلاف العلماء في أنواع التدليس.

يرى الامام الكبير ابن الصلاح الكردي الشهروزي وجماعة أنَّ التدليس على نوعين، وهما (تدليس الاسناد) و (تدليس الشيوخ) في حين ذهب الحافظ الكبير عبدالرحيم الكردي العراقي وجماعة الى أنَّه ثلاثة أنواع، حيث زادوا على النوعين المذكورين نوعاً ثالثاً سموه (تدليس التسوية).

ولا يبدو الخلافُ جوهرياً، لأنَّ الأولين يؤمنون بهذا النوع المزاد أيضاً وكل ما هنالك أنَّهم يعتبرونه صورةً من صور تدليس الاسناد، وليس نوعاً برأسه.

أما النوعُ الأول الذي هو تدليسُ الاسناد فيتجلَّى من خلال صورٍ مختلفة، كأن يروي شخص عن شيخ لقيه وسمع منه مالم يسمع منه، موهماً أنه سمعه منه، او (يروي عمَّن عاصره ولم يسمع منه إلا أنّ كلامه يُوهم بالسماع منه) أو (يروى عن صحيفة من عاصره، لقيه أو لم يلقه، ولكن روايته يتوّهم بالسماع منه) وقد عزِّزت كل هذه الصور بأمثلة واقعية من أعمال المدلِّسين، ومن التي رصدتها أجهزة التسجيل والتصوير من جهابذة المحدّثين.

وربما وجد القاريء في ثنايا هذه النماذج، في القسم الأول أيضاً إشارات الى أمور لابدَّ من معرفتها، وذلك كالشرط الذي أشير إليه ميما يتعلق باللفظه المستخدمة في التدليس، فيجب ألا تقتضي الإتصال والسماع، مثل (سمعت) و (حدثنا) بل توهمهما مثل (عن فلان) و (قال فلان) وما في معناهما، وكالذي ذكرناه من أنَّه (إذا روى عن شيخٍ شيئاً لم يسمع منه موهما أنه سمعه منه) انما يكون تدليساً، اذا كان الشخص المدلِّس سامعاً من ذلك الشيخ شيئاً آخر غير هذا الحديث بحيث ثبت له السماع منه، وأصبح شيخه واستاذه لأنَّ هذا هو أساس تضليل الناس وانخداعهم لانه بسبب روايته عنه لما سمعه منه، يوهم الناس أنَّ ما دلَّسه عنه هو أيضاً ضمن مسموعاته منه، أمَّا اذا روى عن شبخٍ لم يثبتْ له أي سماعٍ منه، فلا يكون ذلك تدليساً، بل هو إرسال على القول الصحيح.

ثم أتى الكلام على (تدليس الشيوخ) الذي لا حذفَ فيه لأيّ إسم، بل يكونُ ريوايةً عن شيخٍ سمع منه ما يرويه عنه، إلاّ أنَّه يصف ذلك الشيخ بوصف لا يُعرفُ من اسمٍ أو كنية أو نسبه أو قبيلة أو بلدٍ كي يوعر الطريق الى معرفة السامع له ويعمّى أمره حتى لا يعرف هذا وقد أوردت لتوضيح هذا النوع ايضاً أمثلة واقعية من فعلات المدِّلسين.

وقد أشير ههنا الى عتاب ابن الصلاح وغيره من العلماء رحمهم الله تعالى للخطيب البغدادي رحمه الله تعالى، حيث اعتبروه لهجاً بهذا النوع من التدليس في مصنفاته، موردين نماذج منها شاهدة على دعواهم ثم أردفت ذلك بدفاع جميل من الشيخ العسقلاني رحمه الله تعالى للخطيب، وتبرير لموقفه.

ثم تحدثتُ عن النوع الثالث الذي هو (تدليس التسوية) والذي شجبه الحافظ العراقي بشدة، واعتبره شرَّ الأقسام كلِّها، وصوره هذا النوع أنْ يروى المدلس حديثاً سمعه عن شيخٍ ثقةٍ وقد سمعه

ذلك الثقة عن شيخ ضعيف، وذلك الضعيف يرويه عن شيخٍ ثقةٍ، فيُبقي المدِّلس شيخه الثقة، ويُسقط شيخَ شيخهِ الضعيف، ويجعله من رواية شيخه الثقة عن الثقة الثاني بلفظ محتمل للسماع كالعنعنة ونحوها، فيُصبحُ الإسنادُ كله ثقات، وفي ذلك غرورٌ شديد، وخطورة من عدة جهات، ككون سلسلة السند ثقاتٍ كلها، والشيخ الذي بعد المدلِّس ثقةً لم يعرف بالتدليس، واستعمال المدلس صيغة السماع عن شيخه، لأنه في الواقع سمعه منه، فهذه الظاهر بمجموعها تقضي على احتمال التدليس رغم وجوده.

ثم ذكرتُ أنَّ أولَ من سمَّاه بالتسوية هو أبو الحسن القطان رحمه الله تعالى، وكان القدماء يسمونه (تدليس التجويد) لابقاء المدِّلس الأجواد فقط في سنده كما ذكرتُ أنَّ مِنْ بينِ مَنْ اشتهروا بهذا النوع بقية بنُ الوليد، والوليد بن مسلم، مورداً نماذج من أقوالهما التدليسية، وبعدها ذكرتُ أنَّ تدليس الشيوخ، لا ينحصر على اسقاط شيخ ضعيف تجميلاً للحديث، وتضليلاً للناس، بل يحتملُ ان يسقط الراوي شيخاً ثقةً إبهاماً بالاسناد العالي، وذكرت مثالاً اورده شيخ الأندلس، ابن عبدالبر رحمه الله تعالى.

وفي القسم الثاني الذي خُصِّصَ لبيان احكام الأنواع الثلاثة للتدليس ورواية المدلِّس، بيّنتُ أنَّ علماء الحديث شجبُوا الأنواع الثلاثة للتدليس شجباً شديداً وذمَّوا مدلِّسيها ربَّما الى حد التجريح، إلا أنه قدْ يكونُ ذمهم لنوع منه أشد ممَّا قالوه في نوع آخر.

أمَّا تدليس الاسناد فاستهجنه أكثر العلماء ويُروى عن شعبة رحمه الله تعالى، أنه اعتبره أخا كذبٍ واقبح من الزنا، مبالغةً في الزجر عنه والتنفير منه.

إلا أنَّ الآفة الكبرى ههنا هي رأي جمعٍ من المحدثين والفقهاء من اعتبار هذا التدليس تجريحاً للمدلِّس، وعلى هذا يُصبح مَن يقوم به ولو مرةً واحدةً ساقط الأهلية، ومردودَ الرواية على جميع الأحوال، أي سواء كرّرَ فعلته أم لا، وسواء صرَّح بالسماع أولا، وسواء دلَّس عن الثقة أولا، وهذا ما نقله الإمام ابن الصلاح عن جمعٍ غفيرٍ من العلماء، وأيَّده الحافظ العراقي ونقل عن الخطيب البغدادي أنَّه نقل أيضاً هذا الرأي في كفايته عن عددٍ من العلماء.

ولكنَّ العراقي نفسه ذكر بعد ذلك رأياً آخر عن ابي الحسن القطان رحمه الله تعالى أنَّه قال: إنَّ الشخص الثقة الذي تقبل روايته يبقى بعد التدليس مقبول الرواية أيضاً، ولكن فيما يصِّرح فيه بالسماع فقط، إما في الذي لا يصرح فيه بالسماع، فلا يوثق به، ولا تقبل روايته.

ثم استأنف ابن الصلاح رحمه الله تعالى الكلام في المسألة قائلا: والصواب التفصيل بين مدلِّس يُصرحُ في روايته بالسماع فيقبلُ منه هذا النوع من رواياته، وبين مدلس لا يصرح فيها بالسماع بل

يوهم به، فنعطي هذا النوع حكم الحديث المرسل وأنواعه، وقد استدل على سداد رأيه هذا بوجود أحاديث كثيرة في الكتب المعتمد كالصحيحين وغيرهما من أشخاصٍ عرفوا بالتدليس كقتادة والأعمش والسفيانين وغيرهم حيث دلّسوا أحاديث كثيرة في رواياتهم الأخرى إلا أنهم قُبل منهم ما صَّرحوا فيه بالسماع حتى من الشيخين، لأنهم لم يعتبروا التدليس كذباً بل ضرباً من الايهام بلفظ محتمل.

وهذا التفصيل الذي ذكره ابن الصلاح رحمه الله تعالى تؤَيّده العقول والنقول، الا أنّه يحتوي على حكم ربما يكون مشكلةً فهو وإن وافقة أكثر العلماء في قبول رواية المدلس الذي يبيّن الاتصال والسماع بنحو (سمعتُ) و (حدثّني) إلا أنهم يخالفونه في مدلس لا يبنيهما بل يوهمهما بنحو (عن فلان) و (قال فلان) فهو منح هذا النوع من المدلس حكم الحديث المرسل، إلا أنَّ جماعة من الذين يقبلون المرسل ويحتجون به، يردون الحديث المدلس ولا يعتبرونه حجةً.

وبما أنَّ الكلام يتسرب الى ذكر الحديث المرسل، وذكر أنَّ بعضاً من العلماء يعتبر المدلَّس كالمرسل، أرى من المستحسن والمفيد أن ألقيَ بعض الضوء على هذا النوع من الحديث وأبيّن رأي العلماء فيه.

هناك آراء مختلفة في المراد من المرسل، إلا أنَّ أرجحها، هو الذي يوقع هذا الاسم على حديث التابعي عن النبي ﷺ مباشرة، كأن يقول (عبدالله بن عامر بن ربيعة) مثلا (قال رسول الله ﷺ) من غير أنْ يذكر اسم الصحابي الذي سمع ذلك الحديث منه عليه الصلاة والسلام.

وقد اختلف المحدثون والاصوليون والفقهاء في احتجاجهم بالحديث المرسَل على رأيين:

يرى الشافعيون وجمع من الصحابة وفقهاء الحجاز رحمهم الله تعالى أنَّ الحديث المرسَلَ لا يحتجُ به، وقد استندوا في اثبات رأيهم على أدلةٍ قويةٍ أشرت اليها بشيء من التفصيل.

ويرى أبو حنيفة و مالك وأحمد وآخرون رحمهم الله تعالى أنَّ المرسل يُحتجُ به، حتى ادعى بعض هؤلاء أنَّ المرسل أولى بالاحتجاج به من المرفوع، لأن من سمَّي لك شيخاً، فقد أحالك الى البحث عنه، والتحري من أحواله، أما الذي لم يسمَّ شيخه رغم كونه ثقةً وأميناً فقد كفاك كل شيءٍ وما عليك سوى الاعتماد عليه، فيما ذكره.

ثم إنَّ أصحاب هذين الرأيين في المرسل يكون رأيهما تجاه المدلَّسِ كالآتي:

اصحاب الرأي الأول الذين لم يحتجوا بالمرسل يُعطون الحكم نفسه للمدلس فلا يحتجون به أيضاً.

أما أصحاب الرأي الثاني المحتجين بالمرسل، فقد انقسموا مع المدلس الى فريقين:

الفريق الأول يجرون حكم المرسل على المدلس أيضاً، فيحتجون بالنوعين كليهما.

أما الفريق الثاني، فيفرّقون بين المرسل والمدلّس، فيحتجون بالاول دون الثاني، لانهم يرون في التدليس تعزيراً وتضليلاً وتمويهاً وتشويشاً، في حين لا يوجد مع الارسال شيءٌ من هذه.

ويلي هذه التوضيحات، الكلام عن الاسباب التي قد تتسبب في تدليس الشيوخ، وتدفع المدلس الى توعير الطريق الى معرفة شيخه، وتعمية أمره.

هذا وقد تشدَّد العلماء في إصدار الحكم على هذا النوع أيضاً، قائلين: اذا قام المدلَّس بهذا التدليس تضليلاً للناس لكون شيخه ضعيفاً عنده وعند غيره، أو عند غيره فقط، فلا يقبل منه حديثه في هاتين الحالتين، وكذلك بالنسبة الى الأسباب الأخرى، الدافعه للتدليس، لا يقبل منه حديثه حتى يتحقَّق من حال شيخه، وآراء العلماء فيه، تعديلاً أو تجريحاً.

وأما تدليس التسوية، فشجبه العلماء بشدة أيضاً واعتبروه شرَّ الاقسام كلها، لانه كما قلنا، ترافقه أسباب قد تعرقل الوصول الى التدليس والشعور به.

وفي القسم الثالث من هذا العمل، والذي خصِّصَ لبيان طُرُق معرفة التدليس، أشيد بالدور الكبير الذي قام به العلماء الجهابذة في ذلك المجال، باذلين جهوداً حثيثةً حتى توصلوا الى عدة طرقٍ من شأنها أنْ ترشدنا الى التعرف على التدليس عند وجوده.

وقد أشير ههنا الى ثمان طرق من التي اكتشفها العلماء بالبحوث والمتابعات والتأمل من الروايات والعبارات منها: (اعتراف المدلس نفسه بأنه دلس حديثه) ومنها (معرفة أهل الحديث بأنّ المدلس لم يسمع أصلاً من الشيخ الذي ادعاه) وست طرق اخرى من امثال هاتين الطريقيتين، مع التمثيل للطرق كلها، بأمثلة واقعية من حياة المدلّسين.

# سەرچاوەکان:


١ـ قورئانی پیرۆز.

٢ــ (اختــصار علــوم الحــديث) دانــراوی ئیبنوکەســیر، چــاپی قــاهیرە، ١٩٥١ز، لەگــەڵ شەرحەکەی (الباعث الحثيث).

٣ـ (الاستيعاب) ئیبنو عەبدولبەڕ، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەیروت ٢٠٠٦.

٤ـ (البداية والنهايــة) ئیبنــو کەســیر دیمەشــقی، بــەیروت، چــاپخانەی (المكتبــة العــصرية) ٢٠٠٨– ١٤٢٨.

٥ـ (تأريخ بغـداد) خــەتیبی بەغــدادی، بــەیروت، چــاپخانەی (دار الكتــب العلميــة)، چــاپی دووەم ٢٠٠٤– ١٤٢٥.

٦ــ (تحفــة الأحــوذي بــشرح جــامع الترمــذي) عەبــدوڕەحمانی موبــارەکفوری، بــەیروت، چاپخانەی (دار الفكر)، ٢٠٠٣ز– ١٤٢٤ك.

٧ـ (تدريب الراوي في شــرح تقريــب النــواوي) جــەلالودینی ســیوگی، چــاپخانەی (مؤســسة الريان)، بەیروت ٢٠٠٥ز.

٨ـ (تذكرة الحفاظ)، حافیزی زەهەبی، بــەیروت، چــاپخانەی (دار الكتــب العلميــة)، چــاپی دووەم، ٢٠٠٧– ١٤٢٨.

٩ـ (التصوير الفني في الحديث النبوي)، سيد قطب، بەیروت، (دار الفكر)، بەبێ ساڵی چاپکردن.

١٠ـ (تقريب التهذيب) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەیروت، چاپی دووەم، ١٣٩٥– ١٩٦٧

١١ـ (التقييد والايضاح لما أطلق وأغلق من كتاب ابن الصلاح) عەبدوڕەحیمی عێراقی، لێکۆڵینەوەی دوکتۆر (أسامة خياط)، بەیروت، (دار البشائر الاسلامية)، چاپی دووەم، ١٤٢٩ك– ٢٠٠٨ز.

١٢ـ (التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد) ئیبنو عەبدولبەڕ، چاپخانەی (دار الكتب العلمية)، بەیروت چاپی دووەم ٢٠٠٣ز.

١٣- (تهذيب التهذيب) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، لێکۆڵینەوەی شێخ عادل ئەحمەد، بەیروت، (دار الكتب العلمية)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤– ١٤٢٥.

١٤- (تهذيب الكمال) ئەبو حەجاج یوسوف میزی، چاپخانەی (مؤسسة الرسالة) بەیروت، چاپی یەکەم ١٤٠٢ك.

١٥- (توضيح الافكار لمعاني تنقيح الانظار) موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی سەنعانی، قاهره، چاپی یەکەم، ١٣٦٦ك.

١٦- (جامع التحصيل في احكام المراسيل) ئەبو سەعیدی عەلائی، چاپخانەی (عالم الكتب)، چاپی سێهەم، ١٩٨٦.

١٧- (الجامع لاخلاق الراوي وآداب السامع) خەتیبی بەغدادی، چاپخانەی (مكتبة المعارف)، ریبات، بەبێ ساڵی چاپکردن.

١٨- (الجرح والتعديل) ئیبنو ئەبی حاتەمی رازی، چاپخانەی (دار الكتب العلمية)، بەیروت، ٢٠٠٢، چاپی یەکەم.

١٩- (حسن المحاضرة في اخبار مصر والقاهرة) جەلالودینی سیوگی، چاپخانەی (دار احياء الكتاب العربي)، بەبێ ساڵی چاپکردن.

٢٠- (الدر الكامنة في أعيان المئة الثامنة) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، چاپخانەی (دار الجيل)، بەیروت، ١٩٧٥.

٢١- (الدر المنتثرة في الأحاديث المشتهرة)، ئیمامی سیوطي، لێکۆڵینەوەی خەلیل مەیس، چاپخانەی (المكتب الإسلامي)، ١٤٠٤ك.

٢٢- (الرسالة)، ئیمامی شافیعی، چاپخانەی (قاهیره)، بەبێ ساڵی چاپکردن.

٢٣- (سير اعلام النبلاء)، ئیمامی زەهەبی، لێکۆڵینەوەی (شعيب الأرنؤوط)، بەیروت، مؤسسة الرسالة، چاپی دووەم، ١٤٢٩– ٢٠٠٨، ٢٨ بەرگ.

٢٤- (الشذى الفياح من كتاب ابن الصلاح) بورهانودینی ئەبناسی، بەیروت، دار ابن حزم، چاپی یەکەم، ١٤٢٧ك– ٢٠٠٦ز.

٢٥- (شذرات الذهب) ئیبنو عیمادی حەنبەلی، چاپخانەی (القدس) لە قاهیره، ١٣٥٠ك.

٢٦- (صحيح مسلم بشرح النووي) چاپخانەی (دار الغد الجديد) قاهيرە، چاپی یەکەم، ١٤٢٩- ٢٠٠٨.

٢٧- (الضوء اللامع في اعيان القرن التاسع) شەمسودين موحەممەدی سەخاوی، چاپخانەی (دار مكتبة الحياة) بەيروت، بەبێ ساڵی چاپکردن.

٢٨- (الضعفاء والمتروكين) ئەحمەدی کوڕی شوعەيبی نەسائی، چاپخانەی (المكتبة الاثرية)، پاکستان، ١٩٦٠.

٢٩- (ضوابط قبول عنعنة المدلس)، بەيروت، (دار الكتب العلمية)، چاپی یەکەم، بەبێ ساڵی چاپکردن.

٣٠- (العلل الكبير) ئيبنو ئەبی حاتەمی رازی، چاپخانەی (دار الكتب العلمية)، بەيروت، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦- ١٤٢٧.

٣١- (علوم الحديث)، دوکتۆر سوبحی ساڵح، چاپخانەی (ستارە)، چاپی یەکەم.

٣٢- (فتح الباري بشرح صحيح البخاري)، ئيبنو حەجەری عەسقەلانی، بەيروت، (المكتبة العصرية)، (١٤٢٦- ٢٠٠٥)، ١٧ بەرگ.

٣٣- (فتح الباقي بشرح ألفية العراقي)، زەکەريا ئەلئەنساری، چايخانەی (دار ابن حزم)، بەيروت، چاپی یەکەم، ١٩٩٩.

٣٤- (فتح المغيث بشرح ألفية الحديث)، شەمسودينی موحەممەدی سەخاوی، چاپخانەی (المكتبة السلفية)، مەدينەی پيرۆز، چاپی دووەم، ١٩٦٨.

٣٥- (فتح المغيث بشرح ألفية الحديث) عەبدوڕەحيمی عێراقی، بەيروت، (دار الكتب العلمية)، (١٤٢١- ٢٠٠١).

٣٦- (الفروق) شەهابودينی قەڕاف، چاپخانەی (دار احياء الكتب)، بەبێ ساڵی چاپکردن.

٣٧- (الكاشف) ئەبو عەبدوڵڵای موحەممەدی زەهەبی، لەگەڵ (ذيل الكاشف)ی ئەبی زورعەی عێراقی، چاپخانەی (دار الفكر)، بەيروت چاپی یەکەم ١٩٩٧.

٣٨- (الكامل في الضعفاء والمتروكين)، ئيبنو عودەی جورجانی قاهيرە ١٩٧٥.

٣٩- (الكفاية في علم الرواية)، خەتيبی بەغدادی، چاپخانەی (السعادة) ميسر چاپی یەکەم ١٩٨٥.

٤٠- (لسان العرب) ئیبنو مەنزوری ئەفریقی، چاپخانەی (دار صادر) بەیروت، چاپی شەشەم ١٤١٨ك.

٤١- (لسان المیزان) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، چاپخانەی (حەیدەر ئاباد)، ١٣٣١ك.

٤٢- (المجروحین من المحدثین) ئیبنو حیبانی بوستی، چاپخانەی (حەیدەر ئاباد)، عەزیزیە، ١٩٦٥.

٤٣- (المجموع شرح المهذب) ئیمامی نەوەوی، بەیروت، (دار الكتب العلمیة)، چاپی یەكەم، ٢٠٠٧- ١٤٢٨، (٢٧ بەرگ).

٤٤- (المستصفی) ئەبو حامید ئیمامی موحەممەدی غەزالی، چاپخانەی (الأمیریة ببولاق)، ١٣٤٤ك.

٤٥- (مشاهیر علماء الامصار)، بەیروت، (دار النصر)، بەبێ ساڵی چاپكردن.

٤٦- (معرفة علوم الحدیث)، حاكیمی نەیسابوری، چاپخانەی (دار الآفاق الجدیدة)، بەیروت، چاپی سێهەم ١٩٧٩.

٤٧- (موسوعة علوم الحدیث)، سەید عەبدولماجیدی غوری، چاپخانەی (دار ابن كثیر) بیروت ٢٠٠٧.

٤٨- (میزان الاعتدال) ئەبو عەبدوڵڵای موحەممەد زەهەبی، چاپخانەی (عیسی الحلبي – القاهرة)، چاپی یەكەم، ١٩٦٣.

٤٩- (النكت) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، چاپخانەی (المجلس العلمي بالجامعة الاسلامیة بالمدینة المنورة)، چاپی یەكەم، (١٤٠٤ك).

# پێڕست

